ڕەهەندەکانی کێشەی

# دارفور

ڕێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم



چاپی یەکەم

## ڕەهەندەکانی کێشەی

# دارفور

ڕێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم

ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران
سلێمانی- ٢٠١٣

## ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

دامەزراوەیەکی کەلتورییە بەپێی بڕیاری کۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان دامەزراوە، ئەرکەکەی بریتییە لە دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی هۆشیارکردنەوەی سیاسی، فراوانکردنی چوارچێوەکانی رۆشنبیریی گشتی، تۆکمەکردنی بەهاکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ودادی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵدا، تاوتوێکردنی مەسەلەکانی بیری هاوچەرخ و دابین کردنی کەرەستەی پێویست بۆ پێگەیاندنی کادیران لە بوارە هەمەجۆرەکاندا.


## رەهەندەکانی کێشەی دارفور

- نووسینی: رێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم
- دیزاین: چێنەر عوسمان
- تایپ: نووسەر
- نرخ: ٣٠٠٠
- تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
- ژمارەی زنجیرە: (٥٠١)
- چاپ: دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی
- ژمارەی سپاردن: (١١١٤)ی ساڵی ٢٠١٣ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمییای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، سلێمانی- ٢٠١٣

سەرپەرشتیاری زنجیرەی کتێب

عوسمان حەمەرەشید گورون

www.pukhoshiari.com

info@pukhoshiari.com

# پێرست

## پێشەکی:

کۆمەڵێک هۆکاری گرنگ هەن وادەکەن مرۆڤی کورد، بە تایبەت لە باشوری کوردستان،لە نزیکەوە ئاگاداری کێشەی دارفور بێت، ئەو هۆکارانەش بریتین لەو خاڵە هاوبەشانەی کە لە نێوان کێشەی دارفور و حکومەتی سوداندا هەیە لە لایەک و ئەو کێشانەی کە لە نێوان کورد و عێراقدا هەبووە لە لایەکی دیکەوە. دەکرێت هەر بە خێرایی سیماو خەسڵەتە هاوبەشەکانی ئەو دوو کێشەیە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆ بکەینەوە:

یەکەم: هەرێمی دارفور زۆربەی دانیشتوانەکەی عەرەب نین بەڵکو بە رەچەڵەک ئەفریقین، بەڵام وەک ئاین و بیروڕای ئاینی موسڵمانن.

دووەم: ئەم هەرێمە ماوەیەکی درێژ سەربەخۆ بووەو بەشێک نەبووە لە سودان، بەڵام بەهۆی داگیرکاری ئینگلیزەوە بۆ ناوچەکە لە سەروبەندی روداوەکانی جەنگی جیهانی یەکەمدا سەرەتا بە هاوبەشی لەنێوان ئینگلیزو میسر بەڕێوە براوە و پاشان بە تەواوەتی لکێنراوە بە سودانەوە.

سێیەم: دانیشتوانە رەسەنەکەی دارفور و ئەو هۆزانەی کە سەدان ساڵە لەو هەرێمەدا دەژین، درێژکراوەی هەمان هۆزو ئێل و تیرەکانی وڵاتانی هاوسنوری خۆیانە بە تایبەت دەوڵەتی (چاد).

چوارەم: پشتگوێخستن و پەراوێزخستنی هەرێمەکە لە ڕووی سیاسی و

ئابووری و بەڕێوەبردن و بەشداریکردن لە دەسەڵاتدا هەمیشە سیاسەتی بەردەوامی حکومەتە عەرەبییە ( سونە مەزهەبەکان)ی سودان بووە بەرامبەر بەم هەرێمە.
پێنجەم: تەعریبکردنی ناوچەی دارفور و پشتیوانیکردنی هۆزە عەرەبەکان و چەکدارکردنیان و ئەنجامدانی کردەوەکانی کۆمەڵکوژی و تاوانی جەنگ و تاوانی مرۆیی بە شێوەیەکی بەربڵاو ئەنجام دراون. هۆزە عەرەبە چەکدارەکان کە خەڵکی دەڤەرەکە بە جەنجەوید (چەتەو پیاوکوژ) ناویان دەبات لە لایەن حکومەتی سودانەوە بە (فرسان) یاخود (جیش شعبی) ناویان تۆمار کراوە، لە راستیدا جەنجەوید دەقاو دەق هاو شێوەیە لەگەڵ ( حرس قومی) بەعسییەکان کە لە کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٣ی خۆیاندا لە عیراقدا دروستیان کرد و لە کوردستاندا چەندین تاوانی رەشەکوژییان دژ بە گەلی کوردستان ئەنجامدا.
شەشەم: پێشمەرگە کە ناوێکی کوردی رەسەنەو ئاماژە بۆ خەباتی گەلی کورد دەکات لە دژی داگیرکەران، لە دارفوریش بە هەمان ناو و بە هەمان مەبەست بە کار دێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بە تەنها لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت دەخوازێت و دەکرێت وەک خاڵێکی پرشنگدار بۆ پێشمەرگەی کوردستان تۆمار بکرێت.
ئەم سیماو خەسڵەتانەو چەندین سیمای دیکەی جیاواز لەو دەڤەرە پێویستی ئەوە دەهێننە ئاراوە کە کورد زیاتر لە بارەی کێشەی دارفورەوە بزانێت و وردتر رۆچێتە نێو دیوە ئاشکراو شاراوەکانی ئەم کێشەیە، بە تایبەت کە مەسەلەی نەوت و ململانێی کۆمپانیا نەوتیەکانی جیهان لەم کێشەدا رۆڵی گرنگ دەبینن.
قەدەرو چارەنوسی دارفورییەکان وایکردبوو کە مەسەلەی رەوای ئەوان

زیاتر لە چوارچێوەی مرۆیی و هاوکاری مرۆیدا خۆی بدۆزێتەوە، دیارە دارفورییەکان خۆشیان لە رەسمکردن و دیاریکردنی ئەم قەدەرەدا رۆڵی خراپیان بینیوە، چونکە راستە کێشەی باشوری سودان (کە ئەمرۆ بە تەواوی لە سودان جیا بۆتەوەو سەربەخۆیی بەدەستهێناوە) کێشەیەکی زیاتر ستراتیژی تر بوو بۆ خۆرئاواو چەندین رەگەزی بەهێزتری لە کێشەی دارفور تێدا بوو بەتایبەت کە باشورییەکان مەسیحی بوون و سۆزی خۆرئاوایان زیاتر بۆ خۆیان رادەکێشا، بەڵام دارفورییەکانیش بەهۆی قبوڵکردنی کولتوور و زمان و ئاینی عەرەبەکانەوە بنەڕەتی خۆیان لاوازتر کرد و بزوتنەوەکانیشیان زیاتر رەنگی ئاینی و ئیسلامی پێوە دیار بوو، ئەوان نەیانتوانی رەگەزی ئەفریقی بوونی خۆیان بکەنە باشترین بەڵگەو باشترین شوناس بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان، تەنانەت لە چەندین بۆنەو لێدوانی سیاسیدا حکومەتی عەرەبی سودان و خۆرئاواییەکانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دارفورییەکان زمانی عەرەبی دەزانن و کولتووریان هاوبەشە لەگەڵ سودانییەکانداو هەمان ئاینیان هەیە بۆیە ئەم مەسەلەیە دەبێتە مەسەلەیەکی ناوخۆیی لە سودان و سنوری گەمەکردنی سیاسی لە بەرژەوەندی دارفورییەکان تەسکتر دەبێتەوە، بۆیە هەروەک بینیمان کێشەی دارفور کە تا ڕادەیەکی زۆر هاوکات بوو لەگەڵ کێشەی باشوری سوداندا نەیتوانی خۆی هەڵداتە سەر مێزی سیاسی دنیاو زلهێزەکانیش چاوی خۆیان لە ئاستیدا نوقاند و کردیانە قوربانی باشوری سودان.

بەداخەوە بەزمانی کوردی توێژینەوە لەسەر مەسەلەی دارفور زۆر کەمە، ئەوەی کە هەیە لە سنوری وتارو سەرنج و رۆماڵکردنێکی خێرا تێنەپەریوە، بۆیە بە باشم زانی وەک سەرەتایەک هیچ نەبێت هەنگاوێک

لەم بارەوە بنرێت و ئەم نامیلکەیە بخەمە بەردەستی خوێنەر.
بۆ نوسینی ئەم نامیلکەیە، گرفتی سەرچاوەم هاتە بەردەم، ئەوەی کە بۆم دەرکەوت ئەوە بوو، کە زۆربەی نوسراوە عەرەبییەکان لەسەر کەیسی دارفور لایەنگری پێوە دیارە، تەنانەت هەندێک لە نوسەرە عەرەبەکانی ئەو کتێبانە نوسینەکانیان پێشکەش کردووە بە ( هەموو ئەو کەسانەی کە بەرگری لە یەکپارچەیی نەتەوەیی سودان دەکەن)، ئەمەش بێگومان ئەوە دەخوازێت کە مرۆڤ هەستیارانە مامەڵە لەگەڵ راستگۆیی ئەو سەرچاوانەدا بکات، بۆیە هەوڵمدا پشت بە سەرچاوەی هۆڵەندی ببەستم بۆ ئەم نوسینە، توانیم کۆمەڵێک توێژینەوەی زانکۆکانی هۆڵەندا پەیدا بکەم کە زۆر هاوکارم بوون لە دەوڵەمەند کردنی نوسینەکە، وێڕای ئەوەش دەستکەوتنی چەندین راپۆرتی لیژنەی لێپێچینەوەی نێودەوڵەتی کە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان رەوانەی دارفوری کرد زیاتر دۆزەکەی بۆ رونترکردمەوەو بوون بە سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری بۆ نوسینەکە.
بەهیوام لە داهاتودا دەرفەتێکم هەبێت بتوانم زیاتر لەم بارەوە توێژینەوە بکەم و ئەگەر بۆشم بکرێت خۆم راستەوخۆ سەردانی ئەو ناوچەیە بکەم و لە نزیکەوە بە کێشەی دارفور ئاشنا بم، هەروەک چۆن دیسانەوە هیوادارم ئەگەر وەک وەرگێڕانیش بێت کتێبخانەی کوردی بەچەند بابەتێکی بەپێز لەم بارەوە دەوڵەمەند بکرێت.

رێکەوت ئیسماعیل ئیبراهیم
سلێمانی- مایسی ٢٠١٢

## دووباره بوونەوەی مێژوو لەهەمان فۆرمدا بەڵام لە جوگرافیایەکی جیاوازدا:

تراژیدیای ئەنفال و کیمیاباران و کۆڕەوەکەی کوردستان، بۆ هەمیشە لە کۆنەستی مرۆڤی کورددا بۆ هەتا هەتایە وەک زامێکی قوڵ دەمێنێتەوە و کاریگەریی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەروونییەکانیشی لەگەڵ خۆیدا دەهێڵێتەوە.

وەک ئەوەی مێژووو دیسانەوە خۆی دووباره بکاتەوە، روداوەکانی هەرێمی کوردستان و ئەو نەهامەتی و ئاوارەبوون و رەشەکوژییەی بەسەر کورددا هاتووە، دیسانەوە لە جوگرافیایەکی دیکەی ئەم دنیایە، هەمان ئەقڵیەتی شۆڤینی و هەمان ئایدۆلۆژیای رژێمێکی باڵا دەستی عروبی بەرامبەر بە کەمایەتییەکی رەسەنی ژێر دەسەڵاتی خۆی دووبارەی دەکاتەوە.

ئەم لێدوانانەی خوارەوە، چەردەیەک لەو چاوپێکەوتن و ریپۆرتاژ و رۆماڵکردنانەن کە لە سەرو بەندی روداوەکانی دارفوردا کەناڵەکانی تەلەفیزیۆن و رادیۆیی هۆڵەندا پەخشیان کردووە. ئەم لێدوانانە زیاتر خوێنەر بە کارەسات و نەهامەتیەکانی دارفور ئاشکرا دەکات و زیاتر لە روداوەکانی نزیکتر دەکاتەوە، لەوەش زیاتر دووباره بوونەوەیەکی سەیر بەدی دەکات لە نێوان ئەو رووداوانەو هەمان شێوەی ئەو رووداوانە لە کوردستان.

نزیکەی سەد هەزار کەس توانیان خۆیان بگەیەننە چادرگای پەنابەرەکان لە چاد، لێرە خواردن و خوارنەوە زۆر کەمە، بەڵام لە سودان بارودۆخەکە زۆر خراپترە، لەوێ لەودیو سنورەوە هیچ شتێک دەست ناکەوێت هەموو شتێک کەمە تەنها چەک زۆرە.

*پەیامنێرێکی کچ بۆ کەناڵێکی تەلەفیزیۆنی هۆڵەندی*

.....

خواردن کەمە، ئاوی خواردنەوە کەمە، دەرمان کەمە، چادر کەمە، خەڵکی لێرە لە ژێر درەختدا دەژین، ئێستا وەرزی باران بارینە، خەڵکی لێرە لەبەر باراندا دەخوسێن.

Ton Koene *دکتۆر لە رێکخراوی پزیشکانی بێسنور بۆ تەلەفیزۆنی هۆڵەندا*

.........

زۆربەی ئەندامانی ئەو هۆزانەی کەدەچەوسێنرێنەوە لەو باوەڕەدان کە تەنها یەک رێگای چارەسەر لەبەردەمیاندا هەیە ئەویش خەبات و شەڕی چەکدارانەیە

Nelson Lukajo *رێکخراوی پەنابەران*

......

بارودۆخمان زۆر خراپە، برسیمانە، هیچمان دەست ناکەوێت بیخۆین، ئاوی خواردنەوەشمان دەست ناکەوێت، تکایە ئاومان بۆ بێنن، ئەگەر توانیتان خواردنیش. لێرە لەبەرسا دەمرین.

Gaber Kora *ژنێکی دارفوری لەبەردەم پەیامنێری تەلەفیزۆندا*

...........

زۆر خزم و کەسوکارم لە دەستداون. بەلام من خۆم فریای خۆم کەوتم و پەلی منداڵەکانم گرت و لەناو دەوەن و لەناو بێشەلاندا خۆم حەشاردا. بەوجۆرە گەیشتمە ئێرە.
Radia ژنێکی هەڵهاتووی دارفور.

....

منداڵەکەم خستە سەر پشتم و رامکرد، دە رۆژ بە رێگاوە بووم، ئیتر منداڵەکەم مرد، چونکە شیرم نەبوو بیدەمێ.
ژنێکی ئاوارەی دارفور

....

لە مانگی سێپتێمبەردا پاش باران بارین ژمارەیەکی زۆر زیاتر لە پەنابەران چاوەڕێ دەکرێن، لە ئێستا ژمارەیەکی زۆر لەو ئاوارانە لە ناو سودان گیریان خواردووە، ئەوان لەناو شیو و دۆڵەکاندا خۆیان حەشارداوە بەلام لەپاش باران بارین لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەو دوڵ و جۆگەو شیوانە دەبنە لافاو. لافاوێکی زۆر ترسناک.
Nicole le Fever پەیامنێری تەلەفیزۆنی هۆڵەندا

....

لە ناوچە سنوریەکانی نێوان سودان و چاد، چەندین گروپی ئاوارەکان گیریان خواردووە، ئەوان چاوەڕێی دەستی رێکخراوەکان دەکەن بەڵکو بیاندۆزنەوە، زۆربەی ئەو گروپانە مانگێکە بەرێگاوەن، زۆربەشیان منداڵ و ئافرەتن، پیاوەکانیان یان بەجێ ماون لە سودان یان کوژراون.
Nicole le Fever پەیامنێری تەلەفیزۆنی هۆڵەندا

....

ناخوازین بگەڕێینەوە بۆ ناو عەرەبەکان، ئەوان دەمانکوژن، ئێرە باشترە لانی کەم ژیانمان پارێزراوە.
ژنێکی دارفوری

...

کچە یەک ساڵانەکەی فاتیمە، کە ناوی سەلمەیە ئێستا زۆر باشترە، بەڵام فاتیمەی دایکی هەر دەگری چونکە چوار منداڵی دیکەی بەجێماون.
Nicole le Fever پەیامنێری تەلەفیزۆنی هۆڵەندا

...

عەرەبەکان هێرشیان کردە سەر گوندەکەمان، فڕۆکەکانیش بۆمبارانیان دەکردین، چەندین منداڵم بینی کە پێوە بوون و کوژران، ئەوانی دیکەش کەوتنە دەستی عەرەبەکان، توانیم هەرسێ منداڵەکەم دەرباز بکەم، منداڵە هەرە بچوکەکەم کردە کۆڵم، ئەوی تریشم بەسەر شانمدا، کچە حەوت ساڵانەکەشم بەدەست بەدوای خۆما راکێشا . ئاوا دەرباز بووم
ژنێکی گەنجی دارفور

...

گرەنتی مانەوە لە ژیاندا لێرە نییە، هەفتەی رابردوو لە نەخۆشخانەی ئەم چادرگایە هەشت منداڵ مردن، زۆر لە دایکانی ئێرە ناخوازن شیری قوتو بە منداڵەکانیان بدەن چونکە دەڵێن ( ئەگەر خوا تەمەنی بۆ منداڵەکەم نوسیبێت و بیەوێت منداڵەکەم بژی ئەوە خودا خۆی ئاگاداری دەبێت).
Nicole le Fever پەیامنێری تەلەفیزۆنی هۆڵەندا

....

نازانم منداڵەکانم چیان بەسەر هاتووە، مێردەکەشم لێ ون بوو، لە کاتی هەڵهاتندا ئێمە لەیەک دابڕاین. ئەبێ چارەنوسیان چی بەسەردا هاتبێت. زۆر بیریان دەکەم.

*ئافرەتێکی ئاوارەی دارفور*

....

حکومەت ئۆتۆمبیل و فرۆکەمان بۆ رەوانە دەکات، بۆمبارانمان دەکەن و دەمانکوژن، جیاوازی لە نێوان پیرو گەنجا ناکەن، منداڵی وەک ئەمەی من فرە دەدەنە نێو ئاگرەوە.

*ئافرەتێکی گەنجی دارفوری*

....

من دەترسم، زۆر دەترسم، کە دنیا تاریک دادێت زیاتر دەترسم ناوێرم ئاگر بکەمەوە نەبادا بەهۆی ئاگرەکەوە شوێنەکەمان بدۆزنەوە، عەرەبەکان بە ئۆتۆمبێل و سواری ئەسپ و حوشترەوە دێن بۆ کوشتنمان و حکومەتیش بە فرۆکە بۆمبارانمان دەکات، تەنها راکردنمان بۆ مایەوە.

*یاسین، کورێکی هەڵهاتوو لە دارفور*

...

ئێمە زۆر جار بۆ ئەوەی کێشمان دابەزێنین بریار دەدەین کە هەفتەیەک نان خواردن کەمکەینەوە، ئەمە کارێکی باشە، بەڵام لێرەدا ئێمە باس لە خەڵکانێک دەکەین کە بەدەستی خۆیان ئەو بریارەیان نەداوە. لێرە خەڵکی بەراستی برسیانەو بەراستی کێشیان دادەبەزێ و لە برساندا دەمرن.

*Claudia de Breij پەیامنێری رادیۆی ٣ FM*

....

ئێمە لەو باوەڕەداین کە لە دارفور جینۆساید ئەنجام دراوە، حکومەتی سودان و میلیشیاکانی جەنجەوید بەرپرسیارن لەو کارە. ئەگەری ئەوە لە گۆڕیدا هەیە کە جینۆساید دووبارە بێتەوە
وەزیری پێشووی دەرەوەی ئەمەریکا کۆلن پاوەڵ



# دارفور له‌ مێژوودا

مێژووی کۆنی ناوچه‌ی دارفور زۆر ئاشکرا نییه‌، به‌ڵام ئه‌وه‌ی که‌ زۆر ئاشکرایه‌ ئه‌وه‌یه‌ که‌ دارفور له‌ سه‌ده‌ی پازده‌یه‌م و شازده‌یه‌مدا به‌هۆی بوژاندنه‌وه‌ی بازرگانییه‌وه‌ پێگه‌یه‌کی زۆر ستراتیژی بۆ هه‌ڵکه‌وت و له‌ ئاکامدا مه‌مله‌که‌تی دارفور سه‌ریهه‌ڵدا.به‌پێی هه‌ندێک به‌ڵگه‌نامه‌ی مێژوویی له‌و سه‌رده‌مانه‌دا هۆزه‌کانی (داجو) باڵا ده‌ست بوون و هه‌ر ئه‌وانیش له‌ ناوچه‌یه‌کی زۆر بچوکتر له‌ دارفوری ئه‌مڕۆ مه‌مله‌که‌ته‌که‌یان دروستکردووه‌، هه‌ر له‌م سه‌رده‌مه‌شدا ئاینی ئیسلام له‌و ناوچانه‌دا بڵاوبۆته‌وه‌.

هه‌تا ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌م دارفور وه‌ک مه‌مله‌که‌تێکی سه‌ربه‌خۆ خاوه‌نی سه‌روه‌ریی خۆی بوو، به‌ڵام والی عوسمانی محمه‌د عه‌لی پادشا هێزه‌کانی به‌ ئاراسته‌ی داگیرکردنی سودان ره‌وانه‌ کرد و له‌ ساڵی ١٨٢١ دا توانی بگاته‌ شاری ( الابیض)ی پایته‌ختی کوردۆڤان و زۆربه‌ی ئه‌و مه‌مالیکانه‌ی که‌ یاخی ببوون له‌ ده‌سه‌ڵاته‌که‌ی، ته‌مێ بکات. به‌ڵام ئه‌م هێزانه‌ له‌و سنوره‌دا مانه‌وه‌ و دارفوریش هه‌تا ساڵی ١٨٧٤ هه‌ر به‌ سه‌ربه‌خۆیی مایه‌وه‌، به‌ڵام له‌و ساڵه‌ به‌دواوه‌ له‌به‌رده‌م پێشڕه‌وی هێزه‌کانی والی عوسمانیدا به‌رگه‌ی نه‌گرت و زۆربه‌ی ناوچه‌کانی دارفور که‌وته‌ ژێر ده‌سه‌ڵاتی هێزه‌کانی خدێویه‌وه‌، ته‌نها ناوچه‌یه‌کی که‌م نه‌بێت له‌ (جبل مرة) که‌ هه‌میشه‌ قه‌ڵای دارفورییه‌کان بوو بۆ گه‌ڕانه‌وه‌ی سه‌روه‌ری خۆیان، زۆربه‌ی خاکی دارفور داگیرکرا.

گرنگترین خاڵ لێرەدا کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەین بریتییەلە بازرگانی کردنی کۆیلە لەو ماوەیەدا، چونکە یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی کێشەی دارفور کە هەتا ئەمڕۆ درێژ بۆتەوە بازرگانی کردنی کۆیلەکان بووە.

لە تەواوی کیشوەری ئەفەریقا لەم ماوەیەدا بازرگانی کۆیلە سەریهەڵداوەو هەتا دوای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەردەوام بووە، عەرەبەکان و ئەڵمان و ئینگلیز و نەمساوییەکان و ئەمەریکییەکان لەم بازرگانییەدا بەشدار بوون.

لەساڵی ١٨٨٣ دا مەهدییەکان شۆڕشێکی مەزنیان لە دژی دەسەڵاتی میسر بەرپاکرد و دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەی خاکی سوداندا گرت و دارفوریش لە ساڵی ١٨٨٤ کەوتە ژێر دەسەڵاتی مەهدییەکانەوە.

هێزی دارفورییەکان کە پێشتر لە ساڵی ١٨٧٤ بە تەواوی تەفروتونا کرابوون، بە پەیدابوونی مەهدییەکان ئامێکیان بەبەردا هاتەوە چونکە بەشێک لە مەهدییەکان لە بنەڕەتدا دارفوری بوون بەتایبەت خەلیفە (عبدالله التعایشی) کە پاشان بوو بە رابەری مەهدییەکان، هەروەها لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پاشاگەردانی لە کاتی مەهدییەکاندا ئیتر خۆیان دیسانەوە دەسەڵاتیان بەسەر ناوچەکانی خۆیاندا سەپاندەوە.

ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٨٨١ دا میسریان داگیرکردبوو، هاوکات لەگەڵ ئەم داگیرکردنەدا، هێزەکانی ئینگلیزو میسر پێکەوە لە ساڵی ١٨٩٨ دا حوکمی مەهدییەکانیان لە سودان کۆتایی پێهێناو (ام درمان) ی پایتەختی مەهدییەکانیان داگیرکرد، لە هەمان ماوەدا و لە ساڵی ١٨٩٩ رێکەوتنێک لە نێوان میسرو ئینگلیزەکاندا بۆ بەڕێوەبردنی سودان مۆرکرا،بەڵام دیسانەوە دارفور نەکەوتەوە ژێر دەسەڵاتی ئەم هێزانەو هەتا ساڵی ١٩١٦ سەربەخۆ بەڕێوە دەبرا.

## دارفور له ژێر چەپۆکی جووت دەسەڵاتی ئەنگلۆ- میسریدا (١٩١٦-١٩٥٦ )

سوڵتانی دارفور لە جەنگی جیهانی یەکەمدا، بەرەی دەوڵەتی عوسمانی هەڵبژارد و بوو بە دوژمنی حکومەتی میسرو ئینگلیز، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە هەردوو حکومەت پێکەوە کۆتایی بە دەسەڵاتی سوڵتانی دارفور( عەلی دینار) بینن و سوپاکەشی تەفروتونا بکەن، لە ساڵی ١٩١٦ دا بە تەواوی بیلکێنن بە سودانەوە.

بەپێی ئەو رێکەوتنەی نێوان میسرو ئینگلیزەکان کە پێشتر ئامارژەمان بۆ کرد، حاکمێکی ئینگلیزی کرا بە سەرۆکی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات و سوپا، بەڵام بۆ پۆستەکانی خوارەوە خدێوی میسر سەرپشککرا، ئەم قۆناغە بە قۆناغی جووت دەسەڵات لە سودان ناوبراوە، لە راستیدا ئینگلیزەکان لەسەرەتادا بە نیازی ئەوە بوون کە ناوچەکانی باشوری سودان و دارفور و کوردۆفان لە سودان جیا بکەنەوە، بۆیە ئەو ناوچانەیان خستە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی خۆیان و بە هەموارکردنی یاسای (ناوچە داخراوەکان) رێگایان بە عەرەبەکانی باکوری سودان نەدەدا لەو شوێنانە دەسەڵاتیان هەبێت یاخود نیشتەجێ ببن، بەڵام رووداوەکانی جەنگی جیهانی دووەم بوونە هۆکاری ئەوەی کە ئینگلیزەکان بە تەواوی واز لەو سیاسەتەی خۆیان بێنن و لە ساڵی ١٩٤٦ بەولاوە ئیتر هەموو ناوچەکانی سودان بە باشور و

دارفوریشەوە لەبەردەم بەڕێوەبەرایەتی عەرەبەکاندا ئاوەڵا کرا و لەمانگی ژانیوەی ١٩٥٦ سودان بە تەواوی سەربەخۆیی خۆی وەرگرت.
بە درێژایی ئەو چل ساڵە ناوچەی دارفور لەژێر بەڕێوەبردنی جووت دەسەڵاتدا بوو، بەڵام لە راستیدا راستەوخۆ ئینگلیزەکان خۆیان بەڕێوەیان دەبرد، بەڕێوەبردنی ئینگلیزەکان لە رێگای پشتبەستنی راستەوخۆیان بوو بە سەرۆک هۆزو پیاوماقوڵ و خانەدانەکانەوە، ئینگلیزەکان بۆ بەڕێوەبردنی هەر ناوچەیەک ئاغایەک یاخود سەرۆک هۆزێکیان راسپارد، ئەم کارەی ئینگلیز تەنها کارێکی سیاسی و ئامادە سازی بوو بۆ ئەو نەخشەیەی کە پاشان هەر خۆی دەستبەرداری بوو، دەنا لە رووی ئابووری و ژێرخانی ئابووریەوە، وەک ئەوەی کات لە ناوچەکەدا وەستابێت، ئەو ناوچەیە هیچ پرۆژەیەکی ئاودێری و کشتوکاڵی و پیشەسازی تێدا نەکرایەوە، تەنانەت پرۆژەی هێڵی ئاسنی نێوان کوردۆڤان و دارفوریش راگیرا. بە درێژایی ئەو چل ساڵە، هەرێمی دارفور لەژێر چەپۆکی جووت دەسەڵاتی داگیرکەردا هەرێمێکی چەپەک و پەراوێزخراو مایەوە، سەرباری ئەوەی کێشەی زۆر قووڵ و مێژوویی لە نێوان هۆزەکانی ئەو هەرێمەدا بەتایبەت لە نێوان ئەفریقی و عەرەبەکاندا هەبوو، بەڵام هیچ چارەسەرێکی جدی بۆ ئەو گرفتانە نەدۆزرانەوە، تەنها لە ساڵی ١٩٣٩ دا سێ جار شەڕی نێوان هۆزەکان سەریهەڵداوە، لە ساڵی ١٩٤٠ راپۆرتی حاکمی گشتی ئینگلیزی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هۆزە عەرەبەکان بەردەوام بەهۆی وشکەساڵیەوە دێنە خوارەوە بۆ ناوچەی هۆزە ئەفریقییەکان و گرفت و کوشتار بەم هۆکارەوە سەرهەڵدەدەن، لەهەمان ئەو راپۆرتەدا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە تەنها لەو ساڵەدا ٢٦ کەس بە تاوانی کوشتن دەستگیر کراون.

بەهەمان شیوە هەمان کەس لە راپۆرتی ساڵی ١٩٤٧ دا باس لەوە دەکات کە بەهۆی کەمبوونەوەی سەرچاوەکانی ئاو، کێشەو گرفتی زۆر پەیدا دەبن و رێژەی بێکاری هەڵدەکشێت و هۆزە عەرەبەکان هەوڵ دەدەن لە ناوچەی هۆزە ئەفریقییەکان نزیک ببنەوەو بۆ خۆیانی داگیر بکەن.
ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تۆماری رووداوەکانی ماوەی جووت حوکم لە دارفور ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە ساڵەکانی ١٩٣٩، ١٩٤٥،١٩٤١،١٩٤٠، ١٩٤٧ تژیە لە رووداوی کوشتن و دزین و هێرش کردنە سەر یەکتری هۆزەکان.
لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٨-١٩٨٩ لە نێوان فور و عەرەب لە جبل مرة، شەڕو کوشتاری خوێناوی روویدا، لە ساڵی ١٩٩٤ لە نێوان الزغاوە، الرزیقات دیسانەوە کوشتار هاتە ئاراوە، زۆربەی جارەکانیش ئەم گرفتانە لە نێوان هۆزەکاندا چارەسەرکراون و سەرۆک هۆزەکان لەنێوان خۆیاندا پێکهاتوونەتەوە.

## بنەمای سەرەکی کێشەکانی دارفور

پانتایی دارفور ٤٩٠ هەزار کلم$^2$ دەبێت و دانیشتوانەکەشی نزیکەی ٦.٧ملیۆن کەسە. زۆربەی هۆزەکانی دارفور لە بنەڕەتدا ئەفریقین و بە ئاین و باوەڕ موسڵمانن، دارفور سنورێکی گەورەی هەیە لەگەڵ چاد و لیبیاو کۆماری سەنترالی ئەفریقیاو دەوڵەتی تازەی باشوری سودان، ئەم پێگە جوگرافییەی دارفور وایکردووە ئەم هەرێمە هەمیشە لەنێو هاوکێشەی ململانێی سیاسیی ناوچەی ئەفریقیادا بێت.
سودان بەر لەجیابوونەوەی باشور گەورەترین وڵاتی ئەفریقی بوو،

ڕووبەرەکەی نزیکەی ٢.٥ کلم٢ دەبوو، بەڵام لە ئێستاداو پاش سەربەخۆبوونی باشوری سودان ڕووبەرەکەی ١.٨ کلم٢ و دانیشتوانەکەشی ٣٩ ملیۆن کەس دەبێت. سودان سنوری لەگەڵ ٧ دەوڵەتدا هەیە کە ئەوانیش بریتین لە هەریەکە لە ( میسر، لیبیا، چاد، سەنترالی ئەفەریقا، ئەتیوبیا، ئەریتریا، کۆماری باشوری سودان)
لەخۆرهەڵاتەوە بەسەر کەنارەکانی دەریایی سوردا دەڕوانێت و پێکدێت لە ٢٦ هەرێم وێڕای ١٢٠ بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ، لە سوداندا ١٣٠ زمان و زاراوە هەیە، کە زمانی عەرەبی زمانی هاوبەشیانە.
سودان وڵاتێکی پاش کەوتووە ژێرخانی ئابووری لاوازی هەیە، تۆڕی ڕێگاو بانی بۆ گرێدانی وڵات نییە، بەشێکی زۆری ناوچەکانی لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵ داری دەژین، لەم دواییانەدا پاش دۆزینەوەی نەوت بازرگانی کشتوکاڵ و کەرتی پیشەسازی تاڕادەیەک بوژاندنەوەی بە خۆوە دیوە. چەقی ئابووری لە ناوچەی ناوەڕاستی وڵات و خەرتومی پایەتەخت چڕ بۆتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ناوچەی جەزیرە ناوچەیەکی بەپیتە و بەرهەمی پەمووی تێدا دەکرێت کە بەرهەمی سەرەکییە لە وڵاتدا، جگە لەم دوو ناوچەیە بەشەکانی دیکەی وڵات وەک دارفور و خۆرهەڵات و باکور و ناوچەی کوردۆڤان فەرامۆش کراون چونکە بەشێکی زۆری بیابانە.
لە ساڵی ١٩٨٣ دا گرفتی باشور سەریهەڵدا و شەڕی خوێناوی توند هەڵگیرسا کە تێیدا پتر لە دوو ملیۆن مرۆڤ کوژران و نزیکەی ٤ ملیۆن مرۆڤیش ئاوارە کران بەڵام لە سالی ٢٠٠٢ دا هەردوولایەنی باشوری سودان و حکومەتی سودان ڕێکەوتننامەی میشاکوس یان مۆرکرد ودوواتر باشوری سودان سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند.

هۆزەكانی فور كۆنترین ئەو هۆزانەن كە لە دارفور ژیاون، هەرچەندە بنەڕەتیان دیار نییە بەڵام زۆربەی باوەڕەكان بۆ ئەوە دەچێت كە ئەوانە لەو ئەفریقیانە بن كە زۆر دەمێكە لە دەڤەرەكەدا دەژین، لەبەر ئەوەی فورەكان رەگەزی سەرەكی بوون لە دانیشتوانی ناوچەكە بۆیە هەموو هەرێمەكە هەر بەناوی ئەوانەوە كراوە بە هەرێمی دارفور، هۆزەكانی فور زمانێكی ( بێژراو یاخود گوتراوی نەنوسراو) دەپەیڤن كە نەوە لە دوای نەوە لە رێگای ئاخاوتنەوە دەگوێزرێتەوە، نەبوونی زمانی نوسراو یاخود لانی كەم زمانێكی هاوبەش لە نێوان هۆزەكانی ئەو دەڤەرە خاڵێكی لاوازی سیاسی و فەرهەنگی بووە بۆ ئەو هۆزانە، ئەمە بۆتە هۆكاری ئەوەی كە ناسنامەی دارفورییەكان هەمیشە بە لاوازی بمێنێتەوەو كات لە دوای كات زیاتر بكەونە ژێر كاریگەرو سڕینەوە لە بەرامبەر زمان و كولتووری عەرەبی و زیاتر ئەوان لە پرۆسەی توانەوەدا بزر بن و سەربەخۆیی كولتووری و سیاسی خۆیان لەدەست بدەن.

توانەوە لە نێو كولتووری عەرەبی باكوری سودان، كارێكی خۆرسك و رێكەوت نەبووە، بەڵكو حكومەتی سودان لەپاش سەربەخۆییەوە بە بەرنامە ئەو كارانەی پیادە كردووە.

سودان لە سەرەتای دروست بوونییەوە بەدەست كێشەی شوناسەوە دەناڵێنێت، ئەگەر سەرنجی نەخشەی سودان بدەین راستەوخۆ چاومان بەو هێڵانەی سنور دەكەوێت كە بە راستەو قەڵەم كێشراون، ئەگەر ئەمە واتایەكی هەبێت ئەوە بێگومان واتای ئەوە دەبەخشێت كە لە دیاری كردنی نەخشەی ئەو وڵاتەدا كۆمەڵێك راستی جوگرافی و ئەتنی و دیمۆگرافی فەرامۆش كراوە. هەروەك لە بەشەكانی پێشوودا

باسمانکرد، ئینگلیزەکان تا ماوەیەکی زۆری پاش جەنگی جیهان یەکەمیش بەتەمای جیاکردنەوەی باشوری سودان و دارفور بوون بە مەبەستی لکاندنیان بە یەکێک لە دەوڵەتە ئەفریقییەکانەوە. هۆکاری ئەمەش لەخۆڕا نەهاتووە چونکە بەڕاستی ئەو ناوچانە هەرگیز بەشێک نەبوون لە سودان، بۆیە لەو کاتەوە سودان بەشوێن پێناسێکی تایبەت یاخود شوناسێکی تایبەت بۆ سودان و سودانییەکان دەگەڕێت، هەروەک زۆربەی دەوڵەتە عەرەبییە نەتەوەپەرستەکان سودان لێبڕاوانە کاریان بۆ ئەوە دەکرد شوناسی عەرەبی و ئیسلامی باکوری وڵات ( شوناسی دەسەڵاتداران) بەسەر تەواوی وڵاتدا گشتگیر بکەن، بۆیە لەم نێوەدا هەوڵەکانیان لە قۆناغی یەکەمدا ( سودانیزەکردنی وڵات) بوو، لە قۆناغی دووەمیشدا بەعەرەبکردنی وڵات بوو.

ئەم سیاسەتەی سودان لەگەڵ باشور شکستی هێناو لە پێشەکی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بۆ کردووە، باشورییەکان وێڕای هۆکاری ئاینی و رەگەزی، هۆکارێکی دیکەی گرنگ هەبوو کە ئەوانی بەرامبەر بە پرۆسەکانی تەعریب کردن و ئیسلامیزەکردن دەپاراست ئەویش بوونی چەندین رێکخراوی تەبشیری جیهانی بوو کە لە بنەڕەتدا لە هەموو کیشوەری ئەفریقا چالاک و دەستبەکار بوون، بەڵام پرۆسەکە لە دارفور زۆر بە باشی سەرکەوتنی بەدەست هێنا چونکە دارفور ئەڵقەی لاواز بوو بۆ حکومەتی سودان، ئەوان راستە عەرەب نین و کولتووریان تەواو جیاوازە لە عەرەبەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی ئیسلام بوون، هەنگاوەکانی تەعریبکردن و سودانیزەکردن زۆر خێرا زەفەری پێبردن. لە میانەی پرۆسەکانی تەعریب کردن و ئیسلامیزەکردنەوە، ئەو ئازادیەی کە هۆزە ئەفریقییەکان بۆ ئافرەتیان دانابوو لە دارفور کەوتە بەر هێرشی

عاباو پەچەی ئیسلامی و لەنێو بران، دانس و سەمای هۆزەکانی دارفور کەوتە بەر نەفرەتی ئیسلام و حەرام کران، زمانی هۆزەکانیش کران بە زمانی قورئان. ئیتر دارفورییەکان رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر لەنێو کۆمەڵگای سوداندا دەتوانەوەو خەسڵەتە جیاوازەکانی خۆیانیان دەسڕییەوە. بەرامبەر بەمە دارفورییەکان بنەڕەتی خۆیان لە دەستدا، ئەوان لە لایەکەوە ئەفریقین و عەرەب نین، کەچی لەملاوە موسڵمانن و حکومەتی عەرەبی سودان دەخوازێت ئەوان وەک موسڵمانی راستەقینە (عەرەب) رەفتار بکەن، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە دارفورییەکان لە نێوان دوو شوناسی لاوازدا هێندەی دیکە لاواز بن، بەتایبەت ئەگەر ئەوان ئامادەش بوونایە لە عەرەب زیاتر عەرەب و موسڵمان بن، ئەوا دیسان لە نێو کۆمەڵگای عەرەبەکاندا وەک پێست رەش و کۆیلەو زنجی تەماشا دەکران.

مێژوونوس و ئەکادمیستی فەرەنسی جیرارد پرونێ ( Gerard Prunier) دارفور بە مۆزایکی گروپە ئەتنییەکان ناو دەبات، هەردوو رۆژنامەنوسی بەریتانی ( Julie Flint) و ئەنترۆپۆلۆژیست (Alex ) لە کتێبەکەی خۆیاندا بە ناوی دارفور مێژوویەکی کورت بۆ جەنگێکی درێژ( Darfur a short history of a long war ) ژمارەی هۆزو تیرەکانی دارفور لە نێوان ٤٠ - ٩٠ مەزەندە دەکەن، هەندێک سەرچاوەی دیکە ژمارەی هۆزەکانی دارفور بە ١٤٥ هۆز هەژمار دەکەن، مستەفا عوسمان ئیسماعیل وەزیری پێشووی دەرەوەی دەوڵەتی سودان، لە کتێبەکەی خۆیدا ژمارەی هۆزەکانی دارفور بە ٨٠ هۆز هەژمار دەکات.

دارفور ناوچەیەکی یەکجار دەوڵەمەندە بە کانزا بەنرخەکان، کۆمپانیای Minexی ئەمەریکی ساڵی ١٩٧٩ لە دارفور مۆڵەتی پشکنینی بۆ

یۆرانیۆم لە پانتایی ٤٨ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەدا وەرگرت، کانزای زێڕیش لە دارفور هەیە کە مافی پشکنین و گەڕانی بە کۆمپانیای Ariab Mining Company Ltd دراوە.

هەروەها کانزای مس بە چڕیەکی بەرز لەهەرێمەکەدا هەیە، هەروەها لە باکوری دارفور ئاسن بەچڕی ٨٠-٩٠٪ هەیە کە سەراپای یەدەگی ئەم کانزایە بە ١٠ملیۆن تۆن هەژمار کراوە، هەروەها کانزای زنگ بە تێکەڵاوی لەگەڵ کانزای ئاسن و قورقوشم هەیە.

دارفور بەڕێژەیەکی بەرچاو بەشداری دەکات لە سەراپای بەرهەمی نەتەوە لە سودان بەتایبەت لە کەرتی کشتوکاڵدا، سودان بە ڕێژەی ٢٢٪ ی هەناردەی کونجی و ١٥٪ی هەناردەی ڕەشەوڵاخ و ٥٪ی هەناردەی کەتیرەو ٩٪ی بەرهەمەکانی دانەوێڵەو تۆوی دانەوێڵە، پشت بە ناوچەی دارفور دەبەستێت.

ڕەنگە بنەمای سەرەکی کێشەکانی دارفور هۆکاری ئابووری بن، بەڵام دەکەوینە هەڵەیەکی گەورەوە ئەگەر پاشخانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی ئەو کەیسە فەرامۆش بکەین، چونکە لە ڕاستیدا هۆکارە ئابووریەکان تەنها ڕەگەزێکی ئاگرئاسا بوون و ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە لە تەقاندنەوەی ململانێکاندا، دەنا بنەماکانی کێشەی دارفور زۆر لەوە ئاڵۆزترن کە تەنها لە چوارچێوەی خزمەتگوزاری و ئابووریدا کورتی بکەینەوە، لێرەدا هەوڵ دەدەین سەرەکیترین بنەماکانی ئەو کێشەیە تاوتوێ بکەین.

## هۆکاری ئابووری:

کشتوکاڵ و ئاژەڵداری سەرەکیترین بواری ئابوورین لە ناوچەکەدا، کەمبونەوەی سەرچاوەکانی ئاو، هەروەها کەمی بارانیش هۆکاری سەرەکین بۆ توند بوونەوەی کێشەکان، چونکە بەهۆی کەمبوونەوەی باران بارین و نەبوونی بیری ئیرتیوازی پانتایی لەوەڕگاکان تا بێت کەمتر دەبێتەوە. هەرچەندە دارفور ٢٠٪ی پانتایی هەموو سودان پێکدێنێت بەڵام پرۆژەی پەرەپێدانی کشتوکاڵ و سامانی ئاژەڵ و پیشەسازی بوونی نییە. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان هۆکارێکی دیکەیە بۆ توند بوونەوەی ململانێکانی ئەو ناوچەیە کە خۆی لە بنەڕەتدا هەژارە. بەرهەمداری زۆرکەمە چونکە ئامرازەکانی کشتوکاڵ و چاندن زۆر سەرەتایین و تەنها بە دەست ئەنجام دەدرێن (کێڵانی دەست). لە دوای سەربەخۆیی سودانەوە لەساڵی ١٩٥٦ لە هەرێمی دارفوردا حکومەت تەنها یەک کارگەی چنینی کردۆتەوە و ئەویش لە ئێستادا لە کار وەستاوە و پەکی کەوتووە.

هەروەها نەبوونی ڕێگاو بان، هۆکارێکی زۆر سەرەکییە بۆ قووڵ بوونەوەی کێشەکان، چونکە هەموو بەرهەمێکی کشتوکاڵی و ئاژەڵی دەبێت تەنها لە ناوچەکەدا مامەڵەی بازرگانی پێوە بکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە داهاتی کشتیارو جوتیارەکان هەمیشە نزم بێت و نەتوانن هیچ پرۆژەیەکی نوێی ئابووری و بەرهەمداری بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن و داهاتیشیان هەر بە دیاریکراوی بمێنێتەوە.

ژێرخانی ئابووری زۆر لاوازە، قوتابخانە و نەخۆشخانە لە بەشی هەرە زۆری ئەم هەرێمەدا بوونی نییە، جەنگە بەردەوامەکانی

باشوری سودان و حکومەتیش بۆتە هۆکاری ئەوەی کە سەرمایەو پارەوپولی وڵات هەمووی بۆ ئەو جەنگە بڕوات ئەمەش کاریکی زۆر خراپی کردۆتە سەر دارفور. زۆرێک لە راپۆرتەکان ( بەتایبەت راپۆرتی نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان یان پرۆنک ٢٠٠٦ ) ئاماژە بۆ بەرپرسیارییێتی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی سودان دەکەن کە خەمسارد بوون لە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە، وێڕای پشتگوێ خستنی تەواو و کەموکوڕی لە بوارەکانی پەرەپێداندا لەچاو بەشەکانی دیکەی سوداندا. بە هاتنەسەرکاری رژێمی ئێستا لە کۆتایی هەشتاکانەوە ئاستی ململانێ و دووبەرەکی لەم ناوچەیە زیادیکرد، بەتایبەت ئەگەر زانیمان پارەو سامانێکی زۆری ئەو وڵاتە لە جیاتی ئەوەی لە بواری پەرەپێدانی ئابووری و بوژاندنەوەدا سەرف بکرێت، دەخرێتە خزمەت دامەزروەی سەربازییەوە.

شێوازی موڵکایەتی زەوی و زار تەواو شێوازی کۆنە کە هۆزەکان لە نێوان خۆیاندا بەپێی نەریتی کۆن زەویەکانیان دابەش کردووە، هەموو هۆزەکانیش ئەو زەویەی کە بەهی خۆیانیان زانیوە تەنها موڵکی ئاغاو سەرۆک هۆزەکان بووە، ئەمەش بۆتە رێگرێک بۆ بەرهەمهێنان و زیاد بوونی بەرهەمداری لەم دواییانەشدا مۆڵکایەتی ئەم زەویانە بۆتە هۆکاری دروستبوونی تێکپرژانی چەکدارانە لە نێوان هۆزەکاندا.

## ململانێی نێوان هۆزە شوانکارەکان و هۆزە کشتوکاڵیەکان:

جگە لە هۆکارە سروشتیەکان هۆکارە مێژوویەکانیش رۆلی زۆر گرنگ دەبینن لەم کێشەیەدا، پەراوێزخستنی هۆزەکانی دارفور بە تایبەت ئەو هۆزانەی کە لە بنەچەدا ئەفەریقین بووە هۆکاری زیندووکردنەوەی

گرفتەكانی تايبەت بە رەگەزپەرستی، بۆ دارفورييەكان تاڵترين يادەوەری كۆيلايەتی و بۆ باكوريەكانيش نوستاليژای كۆيلەداری و بارزگانی كۆيلە، چونكە گەڕانەوەی وێنە سامناكەكانی رابردوو بۆ كۆنەستی كۆمەڵ مەترسيدارترين خاڵە، عەرەبەكان هەتا ئەمڕۆش بە چاوێكی كەمتر و وەكو كۆيلە سەيری ئەو رەگەزانە دەكەن كە بنەچەی عەرەبيان نييە، هەر ئەمەش خۆی لە خۆيدا هۆكاری سەرەكی بووە لەوەی كە حكومەتە يەكبەدوای يەكەكانی سودان (كە زياتر حكومەتی باكور و ناوەڕاستی وڵات بووە) هيچ جۆرە پەرەپێدان و خزمەتگوزارييەک بە رەوا نەبينن بۆ باشوری و دارفورييەكان، بگرە لەوەش زياتر لەهەموو سياسەتەكانی بەڕێوە بردنی وڵاتدا ئەو دەڤەرەيان بە تەواوی پشتگوێ خستووە.

كشتيارەكان لە وەرزی كۆچڕەوی رەوەندە ئاژەڵدارەكاندا ئاستەنگ و بەربەستيان بۆ دروست دەكردن، ئەمەش لە رێگای دروستكردنی چەندين پشتير و تەويلەومۆڵگەی ئاژەڵەوە، وێڕای ئەوەش هەڵدەستان بە سوتاندنی پانتاييەكی زۆری لەوەڕگاكان بۆ ئەوەی رەوەندەكان لە خۆيان دووربخەنەوە، ئەمەش دەبووە هۆكاری دروستبوونی كێشە چونكە رەوەندە ئاژەڵدارەكان بێبەش دەكران لە دەستكەوتنی لەوەڕگا بۆ ئاژەڵەكانيان. هەروەها لە ماوەی چەند ساڵی پێشوشدا لە نزيک رێڕەوی تێپەڕ بوونی رەوەندەكاندا كشتوكاڵيان دەكرد و هەموو زەويەكانيان بە موڵكی خۆيان دەزانی و بە مافی خۆيان دەزانی كە داوای سەرانە لە ئاژەڵدارەكان بكەن. وشكە ساڵی ديسانەوە لەم خاڵەدا رۆڵی زۆر گرنگی بينيوە، چونكە هەتا وشكەساڵی بەردەوام بوايە هۆزە عەرەبە كۆچبەرەكان زياتر بەرەو قوڵايی دارفور دەهاتن

ئەمەش دەبووە هۆکاری بەریەککەوتن و ململانێ. خەمساردی دەسەڵاتی سودان لە پاش سەربەخۆیی و هەروەها جووت دەسەڵاتی ئینگلیز و میسری لە ناوچەی دارفور لە دیاری نەکردنی سنوری جوگرافی هۆزەکان هاوکار بووە لە توندکردنەوەی ململانێی نێوان هۆزەکان لەسەر خاک و لەوەڕگا.

حکومەتی نومەیری بەڕێوەبردنی هەرێمەکەی لەلایەن سەرۆک هۆزەکان و هۆزەکانەوە رەتکردەوە، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە سەرۆک هۆزەکان گرفتەکانیان قوڵتربکەنەوە، چونکە هەر لەسەردەمی ئینگلیزەوە ئەو نەریتە پەیڕەو کرابوو کە سەرۆک هۆزەکان خۆیان سەربەخۆ ناوچەکانی خۆیان بەڕێوە بەرن. حکومەتی سودان لە شوێنی ئەم سەرۆک هۆزانە هەستا بە جێبەجێکردنی حوکمی خۆجێی بەڵام لە ژێر سایەی حکومەتێکی هەژارو لاوازی وەک سودان و نەبوونی دەزگایەکی پۆلیسی تۆکمەو بەهێز گرفتەکانی دارفور قوڵتر بوونەوە چونکە لە لایەک حکومەتێکی زۆر لاواز دانرا کە توانای بەڕێوەبردنی هەرێمەکەی نەبوو، لە لایەکی دیکەشەوە دەسەڵاتی ئاغاو سەرۆک هۆزەکان کورت کرایەوە، ئەمەش بووە هۆکاری دروست بوونی بۆشایی لە دەسەڵاتدا و خەڵکی ناوچەکە خۆی بەچەک بەرگری لە خۆی بکات و یاسای تایبەت بە خۆی دابنێت، ئەوەی بووە هۆکاری توندتر کردنەوەی ململانێکان ئەوە بوو کە لە هەمان ماوەدا وشکە ساڵی و بێ بارانی بەردەوام رووی لە ناوچەکە کرد.

ساڵی ١٩٩٤ کاتێک دیسانەوە کاروباری بەڕێوەبردنی ناوچەکە رێکخرایەوە بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو چونکە حکومەت لە جیاتی ئەوەی خەڵکی ناوچەکە بخاتە نێو پۆستە حکومییەکانی بەڕیوەبردنەوە،

عەرەبی هێناو داینان ئەمەش بووە هۆکاری پەراوێزخستنی زیاتری دارفورییەکان لە بەڕێوەبردنی خۆیاندا، هەروەک چۆن هاوکاریش بوو لە توندکردنەوەی قینی رەگەزپەرستی لە نێوان ئەو هۆزانەدا، چونکە عەرەبەکان وێڕای ئەوەی کە رووت و رەجاڵ و رەوەندو کۆچ بەریش بوون و دارفورییەکان جوتیارو خاوەن زەوی و ماڵی خۆیان بوون و نیشتەجێ بوون، بەڵام عەرەبەکان ئەوانیان هەر بە چاوێکی سووک و نزمەوە سەیردەکرد و وەک کۆیلە تەماشایان دەکردن و رێگایان بە خۆیان دەدا کە بە ئارەزوی خۆیان بێ ئەوەی حساب بۆ ئەو هۆزانە بکەن لە دەڤەرەکەدا نیشتەجێ بن و ئاژەڵداری بکەن و لەوەرگای نوێ بۆ خۆیان دیاری بکەن.

## کێشەی سنور و بڵاوبوونەوەی چەک:

دارفور سنورێکی بەربڵاوی گەورەی هەیە، لەگەڵ سێ دەوڵەتدا ( لیبیا، چاد، ناوەڕاستی ئەفەریقا) ئەم سنورانە لەبەر ئەوەی کاتی خۆی لە لایەن دەوڵەتانی ئیمپریالیستی خۆرئاوا دروست بووە، بۆتە هۆکاری پەرتکردنی هەندێک لە هۆزەکان، ئەمەش بۆتە هۆکاری ئەوەی کە پەیوەندیی پتەو لە نێوان دارفورییەکان و ئەو وڵاتانەدا هەبێت،
دەسەڵاتی حکومەتی ناوەند و دەسەڵاتی خۆجێیی لە دارفور هەرگیز نەیانتوانیوە ئەو سنورە دووروودرێژە بیاباناویە کۆنترۆڵ بکەن، بۆیە هەمیشە ئەو دەڤەرە وەک ترانزێت بۆ پەڕینەوەی چەک و تەقەمەنی بەکار هاتووە، بە تایبەت ئەگەر زانیمان نارچەکە خۆی هەمیشە یەکێک بووە لە ناوچە پڕکێشەکان و ململانێی دەسەڵات و سەربازی

بەقووڵی رەگی تێدا داکوتیوە.
کولتووری چەکهەڵگرتن لە نێو دارفورییەکاندا زۆر بڵاوەو پەیوەندی بە پاشخانی مێژوویی ناوچەیەکەوە هەیە کە پڕیەتی لە گرفت و جەنگ و کوشتار، ململانێی سیاسیش لە نێوان هێزە سودانییەکاندا هاوکار بووە بۆ بڵاو کردنەوەی چەک و بەهێز بوونی بزوتنەوەی یاخی بوون و دروست بوونی باند و گروپی چەتە، کولتووری ئەم هۆزانەش بۆخۆی کردەوەکانی چەکدار بوون و چەتەگەری و هەڵکوتانە سەر یەکتر وەک ئازایەتی و شکۆمەندی تەماشا دەکات، تەنانەت چەک هەڵگرتن و پەنا بردن بۆ چەک لەو دەڤەرەدا هەمیشە رەوشتێکی ئاسایی و باو بووە، لەگەڵ دەستپێکی ململانێ لە ساڵی ٢٠٠١ دا لە هەرێمەکەدا پتر لە نیو ملیۆن پارچە چەک هەبووە.
چەک لە چوار سەرچاوەی جیاوازەوە گەیشتۆتە دارفور، کە ئەوانیش بریتین لە ( سودان، لیبیا، چاد، ئیسرائیل).
لە نێوان ساڵانی ١٩٨٦-١٩٨٩ زۆرترین بڕی چەک و تەقەمەنی لەلایەن خودی سودانەوە برایە ناوچەی دارفور، ئەوێ دەمێ بەرەی نیشتیمانی سودان کە بەرهەڵستکاری سەرەکی حکومەتی جەعفەر نومەیری بوو، زۆرترین بڕی چەک و تەقەمەنی لە ناوچەیەکی دارفور بە ناوی ( وادی هور) لە ٢٠ چاڵدا شاردبۆوە، بەڵام پاش کودەتاکەی (عبدالرحمن سوار الذهب) بەرەی نیشتیمانی بڕیاریدا ئەو چەکانە هەمووی بدات بە سوپای سودان، بەڵام کاتێک سوپای سودان برایە سەر شوێنی چەک و تەقەمەنییەکان بەشێکی زۆری تاڵان کرابوون و کەوتبوونە دەست خەڵکی دارفور، لە هەمان ماوەدا، حکومەتی سادق المهدی هۆزەکانی ( المسيرية و الرزيقات)ی بە مەبەستی راگرتنی هەڵکشان

و بڵاوبوونەوەی هێزەکانی باشوری سودان بە سەرکردایەتی جۆن گەرەنگ، پڕچەک کرد.
ململانێکانی چاد رۆڵێکی زۆری دیوە لە بڵاوبوونەوەی چەک لە دارفور چونکە ئەو هەرێمە وەک ناوچەی گواستنەوەی چەک بەکارهاتووە.
لە پاش شکستی کودەتاکەی سەرهەنگ ( ادریس دبی) دژی سەرۆکی چاد (حسین هبری)، گروپی کودەتاچیەکان هەتا سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی پێشوو کە توانییان حکومەتی ناوبراو بڕوخێنن، لەسەر سنورەکانی دارفور وەک ئۆپۆزیسیۆن تەراتێنیان دەکرد و ئەو دەڤەرەیان بۆ گواستنەوەی هەموو جۆرە چەکێک بۆ خۆیان بەکاردەهێنا، لەوەش زیاتر ژمارەیەکی زۆر لە هۆزەکانی دارفور بە تایبەت لە هۆزی (الزغاوة) لە ریزەکانی ئەم ئۆپۆزیسیۆنەدا چەکدارکران، چونکە ئەمانیش درێژکراوەی هەمان هۆزەکانی چاد بوون و بە ئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانی هاوکاری ئامۆزاکانی خۆیان بکەن.
لیبیاش بەرامبەر بە سەرۆکی چاد ( حسێن هبری) کە هاوپەیمانی ئەمەریکا بوو، فەیلەقێکی ئیسلامی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی ئەو ولاتەدا دروستکردبوو کە ژمارەیەک لە هۆزەکانی دارفوریشیان لەگەڵدا بوو، لێرەوە دارفور کرابووە هێڵی گواستنەوەی چەک بۆ بەرهەڵستکارانی چاد، حکومەتی ئەوسای لیبیا بە سەرکردایەتی سەرهەنگ (موعەمەرقەزافی) خۆی بە هاوپەیمانی سۆڤیەت و دوژمنی ئەمەریکا دەزانی بۆیە بە هەموو توانایەوە کاری بۆ ئەوە دەکرد کە لە پشتەوە هێزێکی ئیسلامیی دارفورییەکان وەک درکەزی لە کەمەری سەرۆکی چاد توند بکات.
چەکی ئیسرائیلی لە بنەڕەتدا بە حکومەتی چاد ( حسێن هبری) دراوە

نەک بە ئۆپۆزیسیۆن، ئیسرائیل بۆ پشتیوانیکردنی حکومەتی چاد لە دژی دەوڵەتە عەرەبییەکان بەشێک لەو چەکانەی لە عەرەبەکانی دەگرت وەک هاوکاری دەینارد بۆ حکومەتی چاد، بەڵام بەهۆی گەندەڵی و لاوازی حکومەتی چادەوە هەندێک لەو چەکانە بەمەبەستی بازرگانیکردن گەشتوونەتە ناوچەی دارفور.

هەروەها هەڵوەشاندنەوەی سوپای ناوەڕاستی ئەفەریقا و دزە کردنی و فرۆشتنی چەکەکانیان هۆکاری دیکە بوون بۆ بڵاو بوونەوەی چەک، ئەمەش بۆتە هۆکاری ئەوەی کە هۆزەکان لە ڕووی چەکەوە هەمیشە بەهێزتر بن لە پۆلیسەکانی حکومەت و چەک و تفاقێکی زۆر لە ناوچەی دارفور بە نرخی گونجاو هەمیشە لە بازاڕەکاندا بن

ئەم هۆکارانە بوونە هۆی بڵاوبوونەوەی تاوان و زۆر بوونی ژمارە و گروپی چەتەو ڕێگرەکان کە ژیانیان بەم سەرچاوەیە دابین دەکرد. ڕووتکردنەوەی هۆزەکانی دیکە وەک بەرگێکی شەرعی بەکار دەهات.

لە نێوان ساڵانی ١٩٩٨-٢٠٠١ کاتێک گرفت لە نێوان هۆزەکانی مەسالیت و عەرەب دروست بوو، ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆڵەکانی مەسالیت بەرەو چاد هەڵهاتن، حکومەتی چاد هەستا بە چەکدارکردنیان. زۆربەی ئەم هۆزانەش هەروەک سەرەتا ئاماژەمان بۆ کرد درێژکراوەی هەمان هۆزەکانی چاد و ناوەڕاستی ئەفریقان و توانیان بزوتنەوەکانی ڕزگاری سودان و عەدالەت و یەکسانی دامەزرێنن.

## گوێپێنەدانی حکومەت و پشتگوێ خستن:

ئەوەی کێشەکانی دارفوری توندترکردووە ئەوە بوو کە حکومەت هەمیشە لە رابردوودا لە ئاستی ئەم کێشانەی کەم کردۆتەوەو تەنها بە کێشەی یاسایی و یاخیبوون لە یاسا باسی کردووە، لەوەش زیاتر هەموو تواناکانی خۆی لە جەنگدا لەگەڵ باشور بە هەدەر بردووە، بۆیە هەرگیز نرخێکی راستەقینەی بەم کێشانە نەداوە، لەوەش زیاتر هەموو جارێک بزوتنەوەکانی دارفوری بە کۆمەڵێک چەتەو رێگر و یاخیبوو لەقەڵەم داوە و لە بەڕێوەبردنی قەیرانەکەدا هەڵەی کوشندەی ئەنجامداوە، هەروەها رێکەوتنی نیفاشا لە نێوان باشوری سودان و حکومەتی سودان بوو بە هاندانێک بۆ دارفورییەکان کە زیاتر سووربن لە سەر داخوازیەکانی خۆیان، لە بەرامبەر ئەمەشدا حکومەتەکانی سودان بەردەوام هەمان سیاسەتی پشتگوێخستنیان پەیڕەو کردووە.

لە بوارەکانی دیکەی خزمەتگوزاریشدا ئەم ناوچەیە وێڕای ئەوەی کە سودان خۆی لە بنەڕەتدا دەوڵەتێکی پەرەسێنی هەژارە ( Poor developing countries)، بەڵام دیسانەوە لە بودجەی گشتی ئەو دەوڵەتەدا کەمترین پشکی گەشەپیدانی ئابووری بەر ئەم هەرێمە کەوتووە، بەپێی ئامارەکانی ساڵی ١٩٣٤ لە هەموو ناوچەی دارفوردا تاقە یەک قوتابخانەش بۆ خوێندنی سەرەتایی بوونی نەبووە، لە کاتێکدا لە هەمان ماوەدا لە هەرێمی باکوری سوداندا ٩٣ قوتابخانەی سەرەتایی هەبووە.

# زمانی ژمارەکان

وشکەساڵی لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمەوە بەرۆکی ناوچەکانی خۆرئاوای سودان و دارفوری گرت، بە درێژایی دە ساڵی رەبەق ئەم ناوچەیە بە تەواوی وشک و برنگ بوو، حکومەتی سودان هیچ هەنگاوێکی بە ئاراستەی چارەسەری کێشەی وشکەساڵی نەنا، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە شوانکارە رەوەندەکان بەرەو باشوری دارفور کۆچ بکەن کە تاڕادەیەک کشتوکاڵی تێدا دەکراو لەوەڕگاشی هەبوو، ئاکامی ئەمەش سەرهەڵدانی شەڕ بوو لە نێوان شوانکارەو کشتیارەکاندا، چەکداربوونی هۆزەکانیش هۆکارێک بوون بۆ خوێناوی بوونی ململانێکان.

- ساڵی ١٩٨٤ نزیکەی ٧٠ هەزار کەس لە خەڵکی دارفور بەرەو ناوچەکانی جەزیرەو پایتەختی سودان کۆچیان کرد.
- هەروەها ٣٥ هەزار کەسی دیکە لە باکوری دارفورەوە بەرەو خێوەتگای پەنابەران لە نزیک شارە گەورەکانی دارفورو کوردۆڤان کۆچیان کرد.
- راپۆرتەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لەنێوان ساڵانی ١٩٨٤-١٩٨٥ دا نزیکەی ١٥٠ هەزار کەس لە دارفور لەبرساندا مردوون کە ئەمەش دەکاتە رێژەی ٦,٧٪ ی دانشتوانی هەرێمەکە.

- ڕێژەی ٢٥٪ی ئەو دانیشتوانەی کە لەدارفور مابوون بەهۆی برسێتیەوە توشی نەخۆشی و زەرەرو زیانی کوشندە بوون.

لە ساڵی ١٩٩٨ لە خۆرئاوای دارفور شەڕی چەکدارانە هاتە گۆڕێ، عەرەبە شوانکارەکان بە خۆیان و ئاژەڵەکانیانەوە بەر لە وادەی کۆچ و لەوەڕ بەرەو باشور دابەزین، لەم شەڕانەدا ٦٠ گوندی هۆزەکانی مسالیت سوتان بەرامبەر ئەمەش تەنها یەک گوندی عەرەبەکان سوتا، ٦٩ کەس لە مەسالیت کوژرا و تەنها ١١ کەسیش لە هۆزە عەرەبەکان، لە ئاکامی ئەم شەڕانەدا ٥ هەزار کەس لە هۆزی مەسالیت بەرەو چاد هەڵهاتن، حکومەتی چاد لە کن خۆیەوە هەستا بە ڕێکخستن و چەکدارکردنی ئەو پەنا بەرانە، ساڵی ١٩٩٩ بە هەمان شێوە شەڕەکان دووبارە بوونەوەو ١٢٥ گوندی مسالیت سوتێنران.

لە ساڵی ٢٠٠١ دا، ململانێ خوێناوییەکان بەرەو ئاقارێکی ترسناکتر ڕۆشتن، لەم ساڵەدا کێشەی دارفور بەتەواوی تەقیەوەو بووە کێشەیەکی سیاسی و مرۆیی و لە تەواوی دنیادا دەنگی دایەوە، لە سەرەتای ئەو ساڵەدا عەرەبەکانی هۆزی (اولاد زید) لە ناوچەی (دار قلا) هێرشیان کردە سەر هۆزەکانی (الزغاوة) و ٧٦ کەسیان لێ کوشتن، لە بەرامبەر ئەمەشدا هۆزە ئەفریقییەکان کە پێشتر خۆیان لە چەند حزب و گروپێکدا ڕێکخستبوو، پەرچەکرداری توندیان نواند، چالاکی هەرە کاریگەری یاخیبووەکان ئەوە بوو کە لە یەک کاتدا لە هەرسێ پارێزگاکەی هەرێمی دارفور بڕیاری شەڕیانداو هێرشیان کردە سەر دامودەزگاکانی حکومەت و بڵاڤۆکی تایبەتی ( سوپای ڕزگاری سودان)یش لەگەڵیدا بڵاوکرایەوە، لەم هێرشانەدا جگە لە ئامانجە سەربازییەکانی حکومەت و فڕۆکەخانەو پۆلیسخانەکان، چەندین ئامانجی دیکەی وەک شارەوانییەکان کەوتنە بەر هێرش.

پەیدابوون و سەرهەڵدانی بزوتنەوەی رزگاری دارفور لە ساڵی ۲۰۰۲ دا بوو بە هۆکاری توندبوونەوەی ململانێکان، بە تایبەت ئەو دوو هۆزە سەرەکییەی کە ئەم بزوتنەوەیەیان دامەزراند ( الزغاوة، الفور) لەگەڵ چەند هۆزێکی عەرەبدا کە لایەنگری حکومەت بوون و بە میلیشیاکانی جەنجەوید ناسراون، ململانێیەکی خویناوی و درێژیان هەبوو. بزوتنەوەی رزگاری دارفور لە ماوەیەکی کورتی پاش دامەزراندنی هاوپەیمانی لەگەڵ چەندین هۆزو تیرەو تایفەی دیکەدا بەست و ناوەکەی خۆشی گۆڕی بۆ ( بزوتنەوەی رزگاریخوازی سودان) و لەگەڵ هێزەکانی حکومەتدا کەوتە رووبەڕووبوونەوەیەکی خوێناوییەوە کە ئەمەش باندۆرێکی خراپی لە ئاستی مرۆیی و کۆمەڵایەتیدا لێکەوتەوە.

لە مانگی مارسی ۲۰۰۳ لەگەڵ توندبوونەوەی وشکەساڵی و سەرقاڵبوونی حکومەتی ناوەندی سودان بە کێشەی باشورەوە، توندوتیژیەکان زۆر خراپ لە هەرێمەکەدا پەرەی سەند، ۷۰۰۰ کەس هاتنەکوشتن و ۳۰۰ گوندیش سوتێنران، بزوتنەوەکانی دارفور دەستیانگرت بەسەر پانتاییەکی زۆری هەرێمەکەدا و هەموو هێزە حکومییەکانیان لە ناوچەکەدا وەدەرنا، لە دیسێمبەری ۲۰۰۳ دا حکومەت زۆر بە توندی بەرپەرچی ئەم هێزانەی دایەوە و شەڕو کوشتار گەیشتە چڵە پۆپە.

## نەتەوە یەکگرتووەکان و کەیسی دارفور

کوشتن و پاکتاوکردن و تاوانی جەنگ و دەرکردن و هەڵهاتن لە جەنگ، بوونە هۆکاری ئەوەی کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لیژنەیەکی تایبەتی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوەی ڕووداوەکان دروست بکات، گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیەش هەر لەو خاڵەوە سەرچاوە دەگرێت کە داخۆ هەموو لایەن و هێزەکانی ناو ئەم کێشەیە تا چەندە یاسا تایبەتە نێودەوڵەتییەکانیان لەم بارەوە پێشێل کردووەو کام جۆرە لە پێشێلکاری و لە چ چوارچێوەیەکدا ئەنجام دراون، چونکە ئەم قەیرانە تەنها ڕەهەندی سیاسی نییە بەڵکو ڕەهەندەکانی مرۆیی و کۆمەڵایەتیش دەگرێتەوە.

لیژنەی نێودەوڵەتی لێپێچینەوە لە مەسەلەی دارفور، لەسەر داوای ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕۆژی ٨ -١٠ -٢٠٠٤ بەپێی بڕیاری١٥٩٣ ی ساڵی ٢٠٠٥ لە دانیشتنی ژمارە ٥١٥٨ دەستی بە کارەکانی خۆی کرد و لە ڕۆژی ٢٥-١-٢٠٠٥ ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش بە ئەمینداری گشتی کرد .

لە ١٨ -٩ -٢٠٠٤ دا پشت ئەستور بە بەندی حەوتەمی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەو هەموو ڕاپۆرتانەی کە لەبەر دەستدا بوون ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری ١٥٦٤ ی دەرکرد بەگوێرەی ئەم بڕیارە دەبوو پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە سودان تاوتوێ بکرێت و بزانرێت کە داخۆ

ئەو پێشێلکاریانە دەچنە نێو چ چوارچێوەیەک و تاوانکارانیش بدرێنە دادگا، ٢٥-١٠-٢٠٠٤ ئەو لیژنەیە لە جنێف دەستی بە کارەکانی خۆی کرد،ئەم لیژنەیە چوار ئەرکی گرنگی لەسەر شان بوو:

یەکەم: تاوتوێکردنی پێشێلکاری یاسا مرۆییە نێودەوڵەتییەکان و یاسای نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ.

دووەم: تەماشاکردنی ئەگەری ئەوەی کە ئەو پێشێلکاریانە دەچنە چوارچێوەی جینۆسایدەوە.

سێیەم: دیاریکردنی ئەو کەس و لایەنانەی کە ئەو پێشێلکاریانەیان ئەنجام داوە.

چوارەم: دیاری کردنی میکانیزمی لێپێچینەوە.

سەرەتای کاری لیژنەکە بە تاوتوێکردنی راپۆرتە ئاشکراو نهێنییەکان دەستپێکرد، سەرچاوەی راپۆرتە نهێنییەکان ئاشکرا نەکراون بۆیە ناتوانین لەم نوسینەدا ئاماژەیان بۆ بکەین بەڵام سەرچاوە دیارو ئاشکراکان دەتوانین بەمجۆرەی خوارەوە دیاری بکەین:

- راپۆرت وزانیاریەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان، رێپێدراو (مفوضیە) ی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مافی مرۆڤ، بیرۆی هاوکاری کاروباری مرۆیی، رێپدراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران، یونیسێف، رێکخراوی تەندروستی جیهانی،یەکێتیی ئەفەریقا، راپۆرتی حکومەتە جیاوازەکان، راپۆرت و زانیاری رێکخراوە حکومییەکان و ناحکومییەکان، زانیاری و راپۆرت و توێژینەوەی بڵاوکراوە لە میدیاکان.
- راپۆرت و زانیاری بەهۆی سەردانی شوێنەکانەوە، لەوانەش سەردانی زیندانی دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی لە خەرتوم، زیندانی دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی لە (نیالا)، زیندانی دەزگای هەواڵگری

سودان له خەرتوم، زیندانی کۆپەر له خەرتوم، هەروەها لیژنەکە هەستا بەسەردانی چەندین شوێن له دەرەوەی سودان لەوانەش له چاد و ئەریتریا و ئەتیوبیا، هەروەها سەردانی چادرگەی پەنابەران له ناوخۆی سودان و به تایبەت له ناوچەکانی دارفور.

- کۆکردنەوەی زانیاری بەهۆی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ جێگری یەکەمی سەرۆک کۆمار (عەلی عوسمان تەها) بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی و دەزگای هەواڵگری، وەزیری داد (عەلی یس) و وەزیری دەرەوەی سودان (مستەفا عوسمان) وەزیری ناوخۆ (عبدالرحیم حسین)، هەروەها ئەنجامدانی چاوپێکەوتن له گەڵ والیەکانی هەرسێ پارێزگاکەی دارفور، هەروەها ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی یاخیبووان.

- دابەشکردنی لیژنەکان بەسەر هەموو ناوچەی دارفوردا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری، لیژنەکەی خۆرئاوای دارفور سەردانی ١٣ شارو شارۆچکەی ئەو دەڤەرەی کرد و ١١٦ شایەتحاڵی راستەوخۆ و ١٢ شایەتحاڵی ناراستەوخۆی بینی، چاوی بە نوێنەرەکانی حکومەت و هۆزەکان و یاخیبوەکان کەوت و زانیاری تەواوی لەسەر ئەو هێرشانە کۆکردەوە کە کرابوونە سەر ٥١ شارو شارۆچکە، وێڕای زانیاری لەسەر ١١ حاڵەتی لاقەکردن، لیژنەکەی باکوری دارفوریش هەمان ئەو چاوپێکەوتنانەی ئەنجامداو سەردانی چەندین چادرگەی پەنابەرانی کرد و له کۆتاییدا توانی زانیاری لەسەر ٧ شوێنی ئەنجامدانی تاوان کۆبکاتەوە و بۆ توێژینەوە له ٩٨ ڕووداوی جیاواز لێکۆڵینەوە لەگەڵ ١٤١ کەس له هەموو لایەنەکان بکات. لیژنەکەی باشوری

دارفویش توانی زانیاری لەسەر ٣٩ حاڵەتی لاقەکردن و شەش لێکۆڵینەوە لە حاڵەتی تاکە کەسیدا بکات و چاوپێکەوتن لەگەڵ زۆربەی لایەنەکانی کێشەکەو ڕێکخراوە حکومی و ناحکومییەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتیی ئەفریقا بکات.

## سروشتی ململانێ لە دارفور

لایەنی سیاسی ئەم کێشەیە دەکرێت وەک جەنگێکی ڕاستەقینە بناسرێت لە پێناو کۆتایی هێنان بە چەوساندنەوەی مێژوویی هەرێمێکی پەراوێزخراوی سودان، هەروەها لە دیدی هەندێک کەسانی دیکەوە ئەمە جەنگێکی خوێناوی نێوان کۆمەڵێک هۆزی عەرەبی و ئەفریقییە لە پێناو دەستبەسەردا گرتنی هەندێک ناوچەی نێوانیان کە خۆی لە بنەڕەتدا بەهۆی کەمی سەرچاوەکانی ئاو یاخود وشکەساڵییەوە بەدەست کەمیی دەرامەت و بەرهەمدارییەوە دەناڵێنێت.
بۆ تێگەشتنی سروشتی ئەم کێشەیە دەبێت جیاوازی لە نێوان ململانێی چەکداری نێودەوڵەتی و ململانێی چەکداری ناوخۆیی بکەین لە چوارچێوەی یاسا نێودەوڵەتییەکانداو بزانین تا چەندە چوار ڕێکەوتنامەکەی جنێفی ساڵی ١٩٤٩ و هەردوو پرۆتۆکۆلی ساڵی ١٩٧٧ بەسەریدا دەچەسپێن.
ململانێی چەکداریانەی نێودەوڵەتی:

مادەی (٢) لە ڕێکەوتننامەی جنێفی ساڵی ١٩٤٩ بەسەر ئەم حاڵەتانەدا دەچەسپێت ( حاڵەتی جەنگی ڕاگەیەنراو یاخود هەر تێکهەڵچونێکی چەکدارانە لەنێوان دوو لایەن یاخود چەند لایەنێکدا، هەرچەندە لایەنەکانیش بە فەرمیی ئەم جەنگە ڕانەگەیەنن یاخود نکوڵی لێبکەن، هەروەها حاڵەتی داگیرکردنی بەشێک یان هەموو بەشەکانی هەرێمێک بە زەبری هێز، هەرچەندە ئەم داگیرکردنە ڕووبەڕووی بەرەنگاری چەکدارانەش نەبوویێتەوە).

بەپێی ئەم مادەیە، ململانێی چەکدارانەی نێودەوڵەتی بریتییەلە ململانێی چەکدارانەی نێوان دەوڵەتێک دژ بەوی دیکە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە داخۆ ئەم شەڕە ڕەوایەتی هەیە یان نا.

ململانێی چەکدارانەی ناوخۆیی:

یاسا نێودەوڵەتییەکان جیاوازی لە نێوان سێ جۆر لە ململانێی ناوخۆیی ( نا نێودەوڵەتی)دا دەکەن:

یەکەم: جەنگی سڤیل- ئەم جۆرە لە جەنگ بەر لە مۆرکردنی ڕێکەوتننامەکە بە (Civil Wars ) دەناسرا، ئەم جۆرە لە جەنگ بەپێی یاسا ناوخۆییەکان ریزبەند دەکرا، بەڵام لە حاڵەتی ڕاگەیەندنی دەسەڵات لەلایەن شۆڕشگێڕان یاخود یاخیبووان ( بۆ نمونە ئەگەر دەوڵەتێکی دیکە بە فەرمی دانیان پێدا بنێت) ئەم جۆرە لە جەنگ ملکەچی بنەما نێودەوڵەتییەکانی یاسای جەنگ (Law of war ) دەبوو، بەڵام ئەم جۆرە لە جەنگ و ددان پێدانانی سروشتی کێشەکە دەبوو سێ مەرجی گرنگ لە خۆ بگرێت:

ئەلف: دەبوو شۆڕشگێڕان بەشێک لە هەرێمەکە یاخود وڵاتەکەیان لەژێر دەستدا بوایە.

بێ: لەسەر ئەو بەشە ئازادکراوە دەسەڵاتی خۆیان ڕاگەیاندایە.
جیم: شۆڕشگێڕان ملکەچی جۆرێک لە ڕێکخستن و سەرکردایەتی سیاسی و سەربازی بوونایە و بنەماکانی جەنگیان پەیڕەو بکردایە.
دووەم: ململانێی چەکداری بەپێی بنەماکانی مادەی سێیەم:
بەپێی ئەم بنەمایە هەموو ململانێیەکی چەکداری لەنێوان دەسەڵاتی ناوەندو هێزێکی یاخی بوو یان شۆڕشگێڕ هەرچەندە ناوچەی ئازادکراو یاخود دەسەڵاتی سیاسی و ئیداریشی ڕانەگەیاندبێت، بە ململانێی ناوخۆ تاریف دەکرێت و بەندەکانی یاسای نێودەوڵەتی مرۆیی بەسەردا دەچەسپێت.
سێیەم: ململانێی نێوخۆیی بەپێی پرۆتۆکۆلی دووەمی ١٩٧٧:
ئەم پرۆتۆکۆلە چەند بڕگەیەکی ڕێکەوتنی جنێف ١٩٤٩ هەموار دەکاتەوە، بەتایبەت لەو بڕگانەی کە تایبەتن بە پاراستنی قوربانیانی ململانێکان و مافەکانیان، هەروەها ئەم پرۆتۆکۆلە بە ئاشکرا حاڵەتەکانی وەک ئاژاوەو کاری گێرەشێوێنی و ئەنجامدانی توندوتیژی و هەر کردەیەکی دیکەی لەو جۆرە ناخاتە نێو چوارچێوەی خۆیەوە.
ئەم پرۆتۆکۆلە دوو سەرنجی گرنگ لە خۆ دەگرێت:
ئەلف: پرۆتۆکۆلی دووەم بۆئەوەی ململانێیەکی ناوخۆیی بخاتە نێو چوارچێوەی خۆیەوە، پێویست دەکات کە هێزێکی ناوخۆیی بەشێکی لە وڵاتەکە یاخود هەرێمەکە خستبێتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، ئەمەش هەمان ئەو مەرجەیە کە لە مادەی سێیەمدا هاتووە.
بێ: ئەم پرۆتۆکۆلە تەنها ململانێی نێوان حکومەتێک و شۆڕشگێڕان لە چوارچێوەی خۆی دەگرێت، هەرچی ئەو ململانێ و کوشتارو شەڕانەش هەیە کە لەنێوان خودی لایەنە نێوخۆییە چەکدارەکانەوە

ئەنجام دەدرێن وەک (شەڕی ناوخۆی لوبنان و ئەنگۆلا)، ناخاتە نێو چوارچێوەی بەندەکانی خۆیەوە.
بەمجۆرە دەکارین بێژین کە ململانێی دارفور ململانێیەکی ناوخۆییە، حکومەت رووبەڕووی لانی کەم دوو گروپی سیاسی و سەربازی جیاواز دەبێتەوە، یاخیبووەکان چەند ناوچەیەکیان خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان و سروشتی ململانێکە و ئاستی کاری گێرەشێوێنی یان تێکدەرانە و تاکەکەسی نییە، بەڵکو سێ خاڵی گرنگی لەخۆ گرتووە:
یەکەم: گروپ و هێزی رێکخراو هەن کە رووبەڕووی حکومەتی ناوەند دەبنەوە.
دووەم: بەشیک لە هەرێمەکە لە ژێر دەسەڵاتی تەواوەتی ئەو هێزانەدایە.
سێیەم: ململانێی چەکدارانەو درێژخایەن بوونی هەیە.
لەبەر بوونی ئەم سێ سروشتەو لەبەر ئەوەی خودی هەردوو لایەنی کێشەکە ( حکومەت و بزوتنەوەکە) ساڵی ٢٠٠٤ خۆبەستنەوەی خۆیان بە رێکەوتنەکانی جنێفەوە راگەیاندووە، کێشەی دارفور دەچێتە چوارچێوەی ململانێی چەکدارانەی ناوخۆوە، لێرەدا مادەی سێیەم لە هەر چوار پەیمانامەکەی جنێفی ساڵی ١٩٤٩ و یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی تایبەت بە جەنگ بەسەر ئەم کێشەیەدا دەچەسپێت، وێڕای ئەوەی کە سودان پرۆتۆکۆلی دووەمی تایبەت بە پاراستنی قوربانیانی ململانێ نێوخۆییەکانی مۆر نەکردووە، بەڵام هەموو ئەحکامەکانی ئەو مادانەی بەسەردا جێبەجێ دەبێت بەتایبەت ئەحکامەکانی پاراستنی دانیشتوانی سڤیل و رەچاوکردنی یاساکانی جەنگ، لەم چوارچێوەیەشدا بەرپرسیارییێتی تەواوی تاوانەکان لە ئەستۆی دەکەوێت بە تایبەت تاوانەکانی جەنگ.

## لایەنەکانی جەنگ لە دارفور

لەلایەن حکومەتەوە هێزە چەکدارەکانی حکومەتی سودان، رۆڵی سەرەکی و راستەوخۆ دەبینێت لە ململانێکەدا، لەملاشەوە دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی و دەزگای هەواڵگری هەڵدەستن بە دیاریکردنی سیاسەت و چوارچێوە گشتیەکانی جێبەجێکردن و دارشتنی پلان و نەخشە، هەروەها میلیشیاکانی جەنجەویدیش هاوکاری راستەوخۆی ئەو هێزانە دەکات لە شەڕەکاندا. سەبارەت بە یاخیبووەکانیش ئەوە لانی کەم دوو گروپی بەهێز بەدی دەکران، هەرچەندە ئاماژە بۆ بوونی نزیکەی ١٩ گروپی جیاواز دەکرێت.
بەرەکانی سەربە حکومەت خۆی لە سێ فۆرمدا دەبینێتەوە:
یەکەم: هێزە چەکدارەکانی حکومەت:
سەرۆک کۆمار، سەرکردەی باڵای هێزە چەکدارەکانی سودانە و هەموو دەسەڵاتەکانی خۆی لە رێگای وەزیری بەرگرییەوە ئەنجام دەدات، ئەویش ( وەزیری بەرگری) سوپا سالاری هێزەچەکدارەکان و سەرۆکی دەستەی ئەرکان و هەر پێنج جێگرەکەی ( ئەرکانی پرۆسەکان، ئەرکانی لۆجستیک، ئەرکانی کارگێڕی، ئەرکانی راهێنان و ئەرکانی ئاراستەکردنی سیاسی) سەرپەرشتی دەکات. ژمارەی هێزە

چەکدارەکانی سودان نزیکەی دووسەد هەزار کەس دەبێت و ئەوەی پەیوەست بێت بە کەیسی دارفورەوە ئەم بەشانەن:
ئەلف: موخابەراتی سەربازی: دەزگایەکی سەربەخۆیە و بەپێی زنجیرەی کارەکانی خۆی راستەوخۆ سەرۆکی وڵات لە هەموو زانیارییەکان ئاگادار دەکاتەوە.
بێ: هێزەکانی بەرگری میللی: ئەم هێزانە بەپێی یاسای بەرگری میللی ساڵی ١٩٨٩ بەهێزی نیمچە سەربازی پێناسە کراون کە پێکدێن لە هاوڵاتی سودانی و بەپێی مادەی شەشەمی ئەم یاسایە بەشێک لە ئەرکەکانیان ئەوەیە کە لە کاتی پێویستدا هاوکاریی هێزی میللی چەکدارو سوپای وڵات بکەن. ئەم هێزانە نزیکەی ٩٠ هەزار چەکدار دەبن.
جیم: موخابەراتی سنور: ئەم دەزگایە بریتییەلە یەکەیەکی ئۆپەراسیۆنی سەربە هێزە چەکدارەکان، لە رێگای هاوڵاتیانی ناوچەکانەوە زانیاری پێویست کۆدەکاتەوە و کاری لەسەر دەکات.
لیژنەی سەرکردایەتی هاوبەش لە سەرۆکی هەموو ئەرکانەکان لە خەرتومی پایتەخت پلان دارێژەری سەرەکی هەموو کاری ئەم هێزە چەکدارانەیەو فەرمان بۆ بەرێوەبەری ئۆپەراسیۆنەکان دەردەکات و لەوانیشەوە بۆ سەرۆکی دەڤەرەکان و پاشان سەرۆکی فیرقەو ئەوجا لیواکان.
دووەم: دەزگای ئاسایشی نیشتیمانی و موخابەرات:
بریتییەلە هێزی چەکداری نەتەوەیی، کە ئەرکی سەرەکی خۆی لە پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو دەرەوەی سودان و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی بارودۆخەکان دەبینێتەوە، ئەم دەزگایە بەهێزترین

دەزگای سیخوڕی سودانەو یاسای ساڵی ١٩٩٩ ی تایبەت بە هێزەکانی ئاسایشی نیشتیمانی سودان ئەرکەکانی دیاری کردووە و سەرۆک کۆمار راستەوخۆ سەرپەرشتی کارەکانی دەکات.

سێیەم: میلیشیاکانی جەنجەوید:

وشەی جەنجەوید لە ناوچەی دارفور واتای دزوچەتە دەگەیەنێت، مەبەست لەمەش هەموو ئەو کردەوانەی دزیکردن و بردنی ئاژەڵ و رەشەوڵاخەکانی ئەو دەڤەرە بووە، وشەکەش لە بنەڕەتدا لە دوو بڕگە پێکهاتووە:

جان: جوید، جان واتە مرۆڤ هەروەها واتای جن و جنۆکەش دەدات، جوید واتە ئەسپ، ئەمەش پێکەوە واتای مرۆڤێکی ئەسپسوار یاخود جنێکی ئەسپسوار دەگرێتەوە. لە کاتی توند بوونەوەی کێشەی هۆزەکاندا بە تایبەت لە سەرەتای نەوەتەکاندا ئەم وشەیە بەرامبەر بە دزو چەتە عەرەبەکان بەکار دەهات کە هێرشیان دەکردە سەر کۆچبەرە ئەفریقییەکانی دارفور. ساڵی ١٩٨٧ لە دارفور هاوپەیمانییەک لە نێوان هۆزە عەرەبییەکاندا بە ناوی (التجمع العربي) دامەزرا، جەنجەویدەکان بوونە باسکی سەربازیی ئەمان .

حکومەتی سودان پەیوەندی لەگەڵ چوار جۆر لە جەنجەوید هەیە:

جۆری یەکەم: ئەمە جۆرێکە لەو میلشیایانەی کە ناڕاستەوخۆ چەک و تەقەمەنی و پێداویستیەکانی خۆی لە حکومەت وەردەگرێت، ئەم هۆزانە بە چەک و توفاقی حکومەت پڕچەک کراون و لەژێر ناوی هۆزو تایفەو خێڵدا بە ئاگاداری حکومەت هێرش و کاری چەتەگەری ئەنجامدەدات و دەستکەوتەکانیش بۆ خۆی هەڵدەگرێت.

جۆری دووەم: ئەمە جۆرێکی دیکەیە لە میلیشیا، کە وەک هێزێکی

سەربازی سێبەر کار دەکات و هێزەکانیشیان دابەشکردووە بەسەر (هێزی زەبروەشێن و سوارچاکدا)، وێڕای ئەوەی کە هەندێکیان لەژێر فەرمانی ئەفسەرێکی سوپادا کار دەکەن، بەڵام لە هەمانکاتدا ئەفسەری سوپاکەو هێزەکەش لە ژێر دەستی سەرۆک هۆزەکەدا دەبێت، ئەم میلیشیایە جۆرێک لە رێکخستنی سەربازی پەیڕەو دەکات و پەیوەندی بە حکومەتەوە هەیە بەڵام هیچ بنەمایەکی یاسایی کارکردنی نییە.

جۆری سێیەم: هێزەکانی بەرگری میللی و موخابەراتی سنور: هەردوو ئەم هێزە لەسەر بنەڕەتی یاسایی کاردەکەن و راستەوخۆ بە حکومەتەوە بەستراونەتەوە و شانبەشانی هێزە سەربازیەکانی حکومەت کار دەکەن. پەیوەندی پتەو لە نێوان ئەم سێ جۆرە لە میلیشیا هەیە، لیژنەی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی تایبەت بە کێشەی دارفور، لەوەرگرتنی لێدوانی جیاوازی سەربەخۆدا گەشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە هێزەکانی بەرگری میللی بەرگی فەرمی سەربازی و چەک و تفاق و پارەو پێداویستییەکانی دیکە بۆ میلیشیاکان دابین دەکەن، هەروەها سەرۆک هۆزەکان بەردەوام و بەبەرنامە لەگەڵ رێکخەری سڤیلی (هێزەکانی بەرگری میللی)دا کۆبونەوە دەکەن و کارەکانیان رێکدەخەن.

چوارەم: حکومەتی سودان لە ئێستادا سەرقاڵی کردنەوەی چوار سەربازگای نوێیە لە ناوچەی دارفور، ئەم سەربازگایانە ناو نراون بە ( سەربازگای لیواکانی پەرچە بەرگریح معسكرات لواء الردع)، بەپێی راگەیاندنێکی وەزارەتی بەرگری سودان لە رۆژی ٢١-٣-٢٠١٢ دا کە لە ماڵپەڕی وەزارەتی بەرگری سوداندا بڵاو کراوەتەوە ئەم هێزە تازانە ژمارەیان دەگاتە هەزار موجاهید و لە چوارچێوەی پاراستنی ئاسایشی دارفوردا بەکار دەهێنرێن، ئەم هێزانە لەبەر ئەوەی تازەن هێشتا

جۆری پەیوەندیان بە حکومەتەوە ئاشکرا نەبووە، بەلام پێدەچێت بکرێنە باسکی پۆلایین بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتە تازەکانی حکومەتی سودان لە دارفور، بە تایبەت کە لە ئێستادا بزوتنەوەکانی دارفور لە هەر کاتێکی دیکە لاوازترن.

لە راستیدا پشتیوانی حکومەتی سودان لە میلیشیاکانی جەنجەوید بوو بە هۆکاری ئەوەی کە نەک تەنها دیموگرافیای ناوچەی دارفور بشێوێت، بەڵکو بووە هۆکاری ئەوەی کە واقعێکی نوێ لە دارفوربێتە ئاراوە، واقعێک کە لە بەرژەوەندی حکومەتی سودانیشدا نەبێت، چونکە لە ئێستادا ئیتر جەنجەویدەکان بوون بە هێزێک هەڕەشە لە خودی دەسەلاتی حکومەتی سودانی دەکەن، ئەوان پاش هێوربوونەوەی رەوشەکەو بەدەستهێنانی ئامانجەکانیان سەرکردەکانیان قەوارەیەکی سیاسییان بۆ هەموو هۆزە رەوەندەکانی عەرەب دروستکرد، ئێستا لە هەوڵی ئەوەدان کەناڵێکی سەتەلایتی سەربەخۆ دامەزرێنن، تەنانەت دەنگۆی ئەوەش لە گۆڕیدا بوو کە ئەم هێزانە بەهاوکاری وڵاتی چاد بتوانن دەسەلات لە دەستی عومەر بەشیر دەربێنن.

حکومەتی سودان ناچێتە ژێر باری وشەی(جەنجەوید) و بە دروستکراوی بێگانەو میدیاکانی خۆرئاوا و پیلانی ئەمەریکا و زایونیزم ناوی دەبات، بەلام لیژنەی لێکۆڵینەوە توانی چەندین بەڵگەی گرنگ لەسەر بوونی جەنجەوید و پشتیوانیکردنی راستەوخۆی حکومەتی سودان لەوان بەدەست بخات، لیژنەکە باس لە کەسێک دەکات کە لەلایەن دەسەلاتدارانی ناوچەکە بە سەرکردەی جەنجەوید ناوی براوە، هەمان ئەو کەسە لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە دیسان بە سەرکردەی جەنجەوید ناوی براوە، کاتێک لیژنەکە ئەو کەسە بانگ دەکەن و

چاوپێکەوتن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا ئەنجام دەدەن خۆی وەک سەرکردەی ( جیش شعبی و فرسان) ناساندووە. لە بەڵگەیەکی دیکەدا کە لیژنەکە بەدەستی خستووە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چەکدارانی ( جیش شعبی و فرسان) بە سواری ئەسپ و حوشترەوە هێرشیان کردۆتە سەر چەندین ناوچەو هەمان ئەو کەسانە لە لایەن خەڵکی ئەو ناوچانەوە ناسراون و بە جەنجەوید ناویان دەبرێت.

لیژنەی لێکۆڵینەوە لە کەیسی دارفور نەیتوانیوە ژمارەی تەواوی جەنجەوید بزانێت، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکانی زانیاری ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لانی کەم لەهەر پارێزگایەکی هەرێمەکەدا گروپێکی گەورەی جەنجەوید هەیە، ئەم گروپە گەورانەش سەرپەرشتی کۆمەڵێک گروپی بچوک دەکەن، لە هەرسێ هەرێمەکەی دارفوردا لانی کەم ١٦ چادرگای جەنجەوید بوونیان هەبووە کە هەر چادرگایەک بە ناوی سەرکردەی گروپەکەی جەنجەویدەوە ناسراوە.



## هێزەکانی پێشمەرگە لە دارفور

ڕەنگە زۆر سەیر بێت بۆ خوێنەری کورد کە لەم نوسینەدا ئاماژە بۆ بوونی پێشمەرگە بکەین لە هەرێمی دارفور، بەڵام ئەوە ڕاستیە و بەشێک لە هێزە یاخیبووەکانی دارفور کە داوای مافی ڕەوای خۆیان دەکەن، ناوی پێشمەرگەیان لە خۆیان ناوە، دیارە ئەمەش هەر هۆکارێکی هەبێت بۆ پیرۆزیی و ڕەوایی بوونی پێشمەرگە لە کوردستاندا دەگەڕێتەوە، ( مستەفا عوسمان ئیسماعیل) سەبارەت بە ناوی پێشمەرگە لە دارفور لە لاپەڕەی ٥٩-٦٠ی کتێبەکەی خۆیدا سەرسوڕماوی خۆی نیشان دەداو بۆ بەرگریکردن لە هێزی چەتەکانی جەنجەوید، یاخود لانی کەم بۆ ئەوەی هێزە بەرهەڵستکارەکانی خۆیان بە جەنجەوید بەراود بکات و بە شاراوەیی هێرش بکاتە سەر کورد و پێشمەرگە، لەم بارەوە دەڵێت:

(ئەدەبیاتی جەنگ و توندوتیژی چەندین ساڵە لە دارفوردا بڵاو بۆتەوە، چەندین زاراوەی دیکەی وابەستە بە میلیشیای هۆزەکان و گروپە چەکدارەکان لە سەر ئاستی ناوخۆ لە هەمان ئەو ماوەیەی کە زاراوەی جەنجەوید پەیدا بوو،سەریانهەڵداوە، کەچی ئەو زاراوانە لەسەر ئاستی جیهان هەروەک چۆن ( جەنجەوید) بە ئامانجی هەندێ مەبەستی تایبەت بڵاوکرایەوە، بڵاو نەبوونەوە. جگە لە جەنجەوید لەو ماوەیەدا لە دارفور چەندین زاراوەی دیکە بڵاوبوونەوە وەک تۆرابۆرا (ئاماژە بە

ئەشکەوتەکانی تۆرا بۆرا لە ئەفگانستان) و زاراوەی پێشمەرگە (ئاماژە بە میلیشیا چەکدارە ناسراوەکانی کورد)، بەڵام هیچ ئاماژە بەم زاراوانە نەدرا، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە لایەنە ناوخۆیی و دەرەکییەکان ئەوانەی کە ئاگری فیتنەو ئاشوبیان لە دارفور هەڵگیرساند مەبەستیان ئەوە بوو کە هەموو کردەوە توندوتیژەکان و پێشیلکارییەکانی مافی مرۆڤ لە دارفور بخەنە ئەستۆی جەنجەوید کە حکومەت پشتیوانی دەکردن، خوازیاری ئەوە نەبوون کە لەبەرامبەردا کە هیچ لەبارەی ئەو کردەوانەوە باس بکەن کە میلیشیاکانی تۆرابۆراو پێشمەرگە لە دارفور ئەنجامیان دەدا، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە ئەو دوو میلیشیایە پەیوەندییان بە بزوتنەوە یاخیبووەکانەوە هەبوو. بەهەرحاڵ ئیتر ماکینەی پروپاگەندەی خۆرئاوا زاراوەی جەنجەویدی بڵاو کردەوەو لە چوارچێوە ناوخۆییەکەی خۆی دەریهێنا و بەهۆی هاوپەیمانی زایۆنی و مەسیحی فووی تێکرا. لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە لۆبیی زایۆنی و لایەنگرەکانیان لە بەڕێوەبەرایەتی ئەمەریکی و دەوڵەتانی خۆرئاوایدا بە ئانقەست زاراوەی جەنجەوید وەک هێما بەکاردەهێنن و لە چوارچێوەی سودان و ناوچەکە دەیبەنە دەرەوە تا هەموو دنیایی عەرەبی بگرێتەوە چونکە مەبەستی ئەوان لێرەدا بە تایبەت بریتییەلە ململانێی نێوان عەرەب و جولەکە.)

لێرەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە نەتەوە پەرستە عەرەبییەکان وەک هەمیشە هەموو گرفتە سیاسییەکانی ناوخۆی وڵاتی خۆیان دەخەنە ملی کەسانی دیکەو وەک پیلانی بێگانەو دوژمنان ناوی دەبەن، دەنا مستەفا عوسمان دەبوو باشتر لە هەموو کەسێک لە کتێبەکەی خۆیدا بچوایەتە ژێر باری ئەوەی کە حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی سودان

گەورەترین زوڵم و ستەمیان لە خەڵکی دارفور کردووە، دیارە ناوبراو دەشزانێت کە حکومەتە هاوشێوەکەی خۆیان لە عێراقی بەعسدا چ کارەسات و نەهامەتیەکی بەسەر گەلانی عێراقدا هێناوە، لە جیاتی ئەوەی دەستی رێز و شانازی بۆ پێشمەرگە درێژ بکات، یاخود لانی کەم وەک کێشەیەکی ناوخۆی کوردستان و عێراق رێگا بەخۆی نەدات لوتی تێوە ژەنێت کەچی هەوڵ دەدات بۆ بەرگریکردن لە چەتەکانی جەنجەوید ناوی پێشمەرگەی لەگەڵدا بەکار بهێنێت.

## لایەنەکانی دیکەی جەنگ:

یەکەم: سوپای رزگاریخوازی سودان: (Sudan Liberation Army)
سوپای رزگاریخوازی سودان باسکی سەربازیی بزوتنەوەی رزگاریخوازی سودانە، ئەم ناوە لە ژێر کاریگەری شۆڕشی باشوری سودان (الحركة الشعبية لتحرير شعب السودان) کە جۆن گەرەنگ سەرکردایەتی دەکرد هاتۆتە ئاراوە.
ئەمە یەکێکە لە بزوتنەوە سەرەکییەکانی یاخیبوانی دارفور، لەرووی ئەندام و پانتایی چالاکییەکانی گەورەترین بزوتنەوەیە، سەرەتای دروست بوونی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٩٩ کاتێک کە زۆرترین ژمارەی هۆزە ئەفریقییەکان بە دەستی عەرەبەکان کوژران، ئەم بزوتنەوەیە یەکەم شانەی چەکداری خۆی کە لە ١٧ کەس پێکهاتبوون لە ناوچەی زالنجی دروستکردکە پارێزەرێک بە ناوی عەبدول واحید محمد نور سەرپەرشتی دەکردن، پاشان لە نێو هۆزەکانی ( الزغاوة، الفور، المساليت) و هەندێ کەسانی هۆزە عەرەبییەکانیش جەماوەریان دروستکرد .

سەرەتا ئەم بزوتنەوەیە بانگەوازی جیابوونەوەو سەربەخۆبوونی دارفوری دەکردو ناوەکەشی بزوتنەوەی رزگاریخوازی دارفور بوو، بەڵام لە راگەیاندراوێکی خۆیاندا لە رۆژی ١٤-٣-٢٠٠٣ دا ناوی خۆی گۆڕی بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی سودان و سوپای رزگاریخوازی سودان، داخوازی دیموکراسی بۆ سودان و جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەتیان بەرزکردەوە، ئەم بزوتنەوەیە زیاتر وەک بزوتنەوەیەکی جەماوەری و پۆپۆلیست خۆی نیشان دەدات و دروشمی ( سودانی نوێ) بەرز دەکاتەوە، پاش ئەوەی حکومەت لەگەڵ بزوتنەوەکانی دارفوردا کەوتە دانوستانەوە چوار باڵی جیاواز لەم بزوتنەوەیە جودا بوونەوە وەک باڵی ئەحمەد عەبدول شافع و رێکخراوی (تنظيم الوحدة) و ( القوى الثورية المتحدة) (التنظيم الديموقراطي الوحدوي).

دووەم- بزوتنەوەی دادپەروەری و یەکسانی (Justice and Equality Movement):

ئەم بزوتنەوەیە لە سالی ٢٠٠١ دا وەک باڵێک لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی سودان خۆی جیاکردەوە و لە دارفور پێکهێنرا، بوو بەشێک لە بزوتنەوەی چەکدارانەی یاخی بوو لە دەسەڵات، پزیشکێک بە ناوی خلیل ئیبراهیم کە دانیشتووی لەندەن بوو، دایمەزراند، هەر لە لەندەنیشەوە یەکەم بلاڤۆکی خۆی بە زمانی ئینگلیزی بلاوکردەوە، ئەم بزوتنەوەیە داوای جیابونەوە لە سودان ناکات بەڵکو داوای جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و دیموکراسی و حوکمی خۆجییەتی دەکات، دامەزرێنەری بزوتنەوەکە خۆی ئەندامێکی کارای پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی بوو، بەیەکێک لە کەسایەتیە هەرە نزیکەکانی حەسەن تورابی هەژمار کراوە، وەزیری پێشوی ئاسایشی سودان بوو.

له مەیدانی کارو چالاکیدا جیاکردنەوەی ئەم بزوتنەوەیە لەوی دیکە زۆر ئاسان نییە، کتێبی رەش وەک ئینجلی ئەم بزوتنەوەیە لە هەمان ساڵدا ئامادە کرا (لەراستیدا ئەم کتێبە (دوو بەرگە)، بەرگی دووەمی لە ساڵی ۲۰۰۳دا بەچاپ گەیەنرا)، لەم کتێبەدا هەموو نەهامەتیەکانی دارفور لە دابەشکردنی نا دادپەروەرانەی دەسەڵات و سامان لە لایەن حکومەت و هەموو ئەو چەوساندنەوەو پەراوێزخستنانەی ئەم هەرێمە لە لایەن دەسەڵاتی عەرەبی سودانەوە، خراوەتەڕوو.

ئەم کتێبە بە نهێنی دەستاودەست دەکرا و ناوی نوسەری لەسەر نەبوو. ئەم کتێبە دابەشکردنی پۆستەکانی حکومەتی بەپێی رەگەز دابەشکرد و سەلماندی کە حکومەت تەنها بۆ خەڵکانی باکورەو خەڵکی ناوچەکانی دیکەی سودان پەراوێزخراون، وێڕای پۆستە گرنگەکانی حکومەت ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە لە کۆی ۸۸۷ پۆستی گرنگی دیکەدا ۸۰۰ پۆست لە لایەن باکوریەکانەوە قۆرغ کراون، زۆربەی جەنگاوەرانی ئەم بزوتنەوەیە لە هۆزەکانی زغاوەن. لە ساڵی ۲۰۰٤ دا بزوتنەوەکە بوو بە دوو باڵەوە، باڵیکیان بە رابەری خەلیل ئیبراهیم و باڵەکەی دیکەش بە رابەری هەندێک سەرکردەی سەربازی لەوانەش عەقید جبریل. ئەم بزوتنەوەیە کە زیاتر لە ژێر کاریگەری ئیسلامی سیاسیدا بوو خەلیل ئیبراهیم لە یەکێک لە شەڕەکاندا لەگەڵ سوپای سودان لە رۆژی ۲٥ی دیسێمبەری ۲۰۱۱ کوژرا. (حرکة الاصلاح)، (حرکة ادریس الازرق)، (حرکة بحر ابو جردة) کۆمەڵێک رێکخراون کە لەم بزوتنەوەیە جیابوونەوە.

سێیەم: گروپە یاخیبووەکانی دیکە:

هاوپەیمانی فیدراڵی ( التحالف الفدرالي) بەهێزترین گروپی بچوکە

له دارفور، احمد ابراهیم دریج بەرپرسی ئەم رەوتەیە، له سەردەمی جەعفەر نومەیریدا خۆی والی هەرێمی دارفور بوو، بەڵام له پاشاندا بە هۆکاری سیاسی دەستی له پۆستەکەی هەڵگرت و بە شێوەیەکی هەمیشەیی له لەندەن نیشتەجێ بوو، هەر له ئەوروپاشەوە سەرۆکایەتی رەوتەکەی خۆی دەکات.

ساڵی ٢٠٠٤ کۆمەڵێک گروپی دیکەی یاخیبوو سەریانهەڵدا لەوانەش بزوتنەوەی نیشتیمانی بۆ ریفۆرم و گەشەپێدان، زۆربەی سەرکردەو سەربازەکانی ئەم گروپە له هۆزی ( الزغاوة، کوبیرا)ن، ئەم بزوتنەوەیە بەشێوەیەکی سەرەکی له شاری(طنية) ی سەرسنوری چاد و ناوچەی (جبل مون) له خۆرئاوای دارفور بوونیان هەیە. هەروەها گروپێکی دیکە بەناوی (کەرباج) کە له هۆزە عەرەبەکان پێکدێت و گروپیکی دیکەش بەناوی (الشهامة) له خۆرئاوای (کوردۆفان) کە له بەری خۆرهەڵاتەوە له دارفور نزیکە، له دیسێمبەری ٢٠٠٤ دا گروپێکی دیکە بە ناوی (بزوتنەوەی نیشتیمانی سودان دژی پەراوێزخستن) له خۆرئاوای (کوردۆڤان) دروست بوو.

## پەرەسەندنی ململانێکان له دارفور:

بە درێژایی مێژووو له ناوچەی دارفوردا کێشە لەسەر لەوەڕگاو زەوی کشتوکاڵی و سەرچاوەی ئاو هەبووە، هەموو جارێک ئەم کێشانە بە پێکهاتن و سازانی هۆزەکان چارەسەرکراوە، لەنێوان ساڵانی ١٩٣٢ هەتا ساڵی ٢٠٠١ لیژنەی تایبەت بە تاوتوێکردنی گرفتەکانی ناوچەکە ٣٦ ململانێی چەکداری باس کردووە کە هۆزەکان له نێوان خۆیاندا و

هەندێک جاریش بە سەرپەرشتی حکومەت، چارەسەریان کردووە.
بەڵام لە کۆتایی ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا گرفتی وشکەساڵی و فراوان بوونی پانتایی بیابانەکان کێشەکانی قوڵتر کردەوە چونکە لە ئێستادا تەنها ٥ کلم لە دەرەوەی شارەکاندا، بیابان دەستپێدەکات.
لە ماوەی نێوان ٢٠٠١-٢٠٠٢ هەردوو بزوتنەوەی (سوپای رزگاریخوازی سودان و بزوتنەوەی دادپەروەری و یەکسانی) ریزەکانی خۆیان رێکخست و حکومەتی خەرتومیان بە هۆکاری گرفتەکان تاوانبار کرد.
لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٣ دا ئەم بزوتنەوانە دەستیان بە هێرشی سەربازی خۆیان کرد و چەندین شەڕی خوێناوییان لە ناوچەکانی (کتم، طنیة، الفاشر) ئەنجامدا. حکومەت و میلیشیاکانی جەنجەویدیش بەرامبەر بەم کارانە چەندین هێرشی بەرامبەریان ئەنجامدا.
وێڕای ئەوەی پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان هێزە بەرهەڵستکارەکاندا نەبوو، بەڵام هەموویان پەراوێزخستنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی لە دارفور بە بەڵگە دەهێننەوە بۆ کارەکانیان و بەرنامەی سیاسی خۆیان لەسەر بنەڕەتی ئەو داخوازیانە رێکخستووە کە مافەکانی خەڵکی دارفور داوادەکات لە بەشداریکردنی دادپەروەرانە لە حکومەتی ناوەند و حکومەتە ناوخۆییەکاندا، وێڕای داخوازی چاکسازی و گەشەپیدانی ئابووری.
پەرچەکرداری حکومەتی سودان لە سەرەتادا زۆر سست بوو، چونکە هەموو هێزو توانا سەربازیەکانی خۆی لە بەرەی شەڕەکانی باشوردا وەگەڕخستبوو، وێڕای ئەوەش لەبەر ئەوەی زۆربەی کارمەندو پۆستە سەربازیەکانی ناوچەکە لە خەلکانی دارفور خۆی بوون و ئامادەی شەڕکردن نەبوون دژ بە هۆزەکانی خۆیان لە پێناو وڵاتی سوداندا،

بۆیە حکومەتی سودان لە جیاتی بیرکردنەوە لە چارەسەرکردنی کێشەکان بڕیاری ئەوەیدا کە هۆزەکانی ناوچەکە بکات بەگژ یەکترداو شەڕی دارفورییەکان بە عەرەبەکان بکات، بۆیە لەم بارەوە داوای لە هۆزە عەرەبە کۆچبەرەکان کرد کە هاوکاری حکومەت بکەن، ئەم هاوکاریەش بێگومان بەرامبەر بە پێدانی زەوی و زارو پارەوپول بوو لە بودجەی لاوازی ناوچەی دارفور خۆی.

لە نێوان سالآنی ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤ دا، حکومەتی سودان چەندین هێرشی گەورەی کردە سەر ناوچەکانیان، ئەم هێرشانە بۆردۆمانی تۆپ و هێرشی ئاسمانی لە خۆ گرتبوو، هێرشەکان کوێرانە بوون و تەڕو وشکی پێکەوە دەسوتاند، هاوشانی ئەم تۆپ بارانکردنانەش لەسەر زەوی هێرشی سەربازان و میلیشیاکانی جەنجەوید ئەنجام دەدراو چەندین شێوازی کوشتن، هەتککردن، لاقەکردن، ئەشکەنجەدان، رفاندن، دزینی ئاژەڵ و راوڕووت ئەنجام دەدران. بەرامبەر بەم هێرشانە گروپە بەرهەڵستکارەکانی دارفور دژە هێرشیان ئەنجام دەداو لە چوارچێوەیەکی بچوکتریشدا چەندین کرداری توندوتیژی هاوشێوەیان ئەنجامدا.

# هەڵوێستی نێودەوڵەتی بەرامبەر کەیسی دارفور

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین تیشکێک بخەینە سەر ڕەنگدانەوەی کێشەی دارفور لە سیاسەتی هەندێک لە دەوڵەتانی جیهاندا، بەو پێیەی کە ئەم کێشەیە لە چەندین ڕەهەندی یاسایی و مرۆیی و سیاسییەوە جگە لە دەوڵەتانی دراوسێی سودان، جێگای بایەخ و سەرنجی وڵاتانی دیکەش بووە، لە پێش هەموشیانەوە ئەمەریکا، بەدەر لە باسکردنی هەندێک وردەکاری مێژوویی بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتی دەوڵەتانی خۆرئاوا بەرامبەر بە کەیسی دارفور تاڕادەیەکی زۆر هاوبەش و چونییەک بوو، ڕاستە دەوڵەتانی وەک ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا لە وردەکارییەکانی ناوچەی ئەفەریقا ڕۆژەڤی تایبەت و سەریەخۆیان هەیە، بەڵام لە ڕووی سیاسیەوە پەرچەکرداری ئەوان لە نێو کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان تا ڕادەیەکی زۆر چون یەک بوو، هەر هەموویان پێکەوە بڕیارەکانی تایبەت بە سودان و دارفوریان تێدەپەڕاند و هیچ کام لەوان لە هێڵەگشتییەکانی ئەو سیاسەتەدا ناکۆک نەبوون، بۆیە لێرەدا وەک دیدو هەڵوێستی خۆرئاوا تەنها تیشک دەخەینە سەر سیاسەتی ئەمەریکا بەرامبەر بەو کەیسە و لە بەشەکانی دیکەی ئەم نوسینەدا بەشێوەیەکی خێرا دیسانەوە چەندین خاڵی دیکەی ئەو سیاسەتانە باس دەکەینەوە.

بەڵام سەبارەت بە دەوڵەتانی دراوسێی سودان ئەوە دەبێت زیاتر لەسەریان ڕاوەستین چونکە تێگەشتن لە کێشەی دارفور و پەیوەندی ئەو وڵاتانە لەو کەیسەدا بۆ ئەم نوسینە بایەخی خۆیان هەیە.

## ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا:

سۆمال و سودان و کۆنگۆ سێ ناوچەی گەرمی ململانێ بوون کە هەمیشە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکادا بایەخی تایبەتی هەبووە. سیاسەتی ئەمەریکا بە گشتی لەم ناوچانەدا جگە لە چوارچێوەی سیاسی و ئاسایشی و مرۆیی چوارچێوەیەکی ئابووریشی هەبووە.
حکومەتی سودان کۆمەڵێک خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەبوو کە لە دیدی ئەمەریکاوە ناتەبا بوو لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیدا لە ناوچەی ئەفریقا، حکومەتی سودان حکومەتی ئیسلامی و عەرەبی توندڕەو بوو، مافەکانی مرۆڤ تێیدا زۆر بەشێوەیەکی دڕندانە پێشێل دەکران، سودان بەر لە جیابوونەوەی باشور گەورەترین دەوڵەتی ئەفریقا بوو کە چەندین جەنگی ناوخۆی خویناوی تێدا سەریهەڵدابوو، بەردەوام پشتگیری لە گروپە ئیسلامییە توندڕەوەکانی وەک ئەلقاعیدەو حەماس دەکرد ( بن لادن ماوەیەکی دیاریکراو لەژێر پارێزگاری حکومەتی سوداندا بوو، لەم بارەوە ئەمەریکا لە سەردەمی بەرێوەبەرایەتی بیل کلنتندا هێرشی ئاسمانی و ڕۆکێتی کردە سەر ئەو وڵاتە).
لە مرۆدا مەسەلەکانی تیرۆر، مافەکانی مرۆڤ و کۆمەڵکوژی، هەژاری، کۆچکردن، جێندەر، نەخۆشی و کارەساتە سروشتیەکان بابەتگەلێکی گرنگن لە ڕەسمکردنی سیاسەتی دەرەوەی زلهێزەکان کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە.
ڕووداوەکانی سێپتێمبەری ئەمەریکا لە ٢٠٠١ دا ڕۆلی سەرەکی بینی

له دارشتنەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا و سودانیش یەکیک بوو لەو دەوڵەتانەی کە بەڕێوبەرایەتی بۆش بایەخی تایبەتی پێدا.
پێگەی سودان لە ئەفریقا پێگەیەکی زۆر ستراتیژییە، دەروازەیەکە بۆ ناو تەواوی دەوڵەتە ئەفریقییەکان، وێڕای ئەوەش پێگەی سودان بۆ کۆنترۆڵ کردنی ناوچەی ( شاخی ئەفریقا ) لە ڕێگای کۆنترۆڵ کردنی دەریای سور، وایکردووە کە بایەخی جیۆسیاسی سودان هەمیشە گرنگ بێت. ململانێی نێوان ئەمەریکا و خۆرئاوا لە لایەک و دەوڵەتی زلهێزی چین لە لایەکی دیکە بۆ دەستگرتن بەسەر ئەفریقادا، خاڵێکی دیکەی گرنگە لە کۆی ململانێکانی ئەو دەڤەرە، دۆزینەوەی نەوت لە سودان هاوکار بوو بۆ توندبوونەوەی ململانێی نێوان ئەو هێزانە لەسەر سودان.
ئەمەریکا بەتوندی لە رۆژەڤی کارەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان سەبارەت بە کەیسی دارفور ئامادەیی هەبوو پانتاییەکی فراوانی پێدا، هەروەها لە رەوانەکردنی دۆسیەکەشدا بۆ دادگای تاوانی نێودەوڵەتی رۆلی هەبوو.
لە راستیدا ڕووداوەکانی سێپتێمبەر رێگا خۆشکەر بوون بۆ ئەوەی رای گشتی ئەمەریکا بەرامبەر بە ئیسلامی سیاسی و خودی ئاینی ئیسلام و عەرەب بە بچوکترین رووداو بهەژێن و بە ئاسانترین شێوەش مۆبۆلیزە بکرێن لە بەرژەوندی هەندێک سیاسەتی تایبەتی.
میدیاکانی خۆرئاوا و گروپە مەسیحی و ئەفریقییەکانی ئەمەریکا، بۆ فشار خستنە سەر رای گشتی توانیان کار لەسەر رەهەندی ئەفریقی بوونی کێشەی دارفور بکەن، ئەوان بە تایبەت مەسیحییە راستڕەوەکان زیاتر ململانێکانیان دەبەستەوە بە ململانێی نێوان رەگەزی ئەفریقی

و ڕەگەزی عەرەب، ئامارەیان بۆ کوشت و بڕ و جینۆساید و تەنانەت زیندووکردنەوەی کۆیلەداری دەکرد لە سودان، چونکە لە ماوەی شەڕو کوشتارەکانی دارفوردا دەنگۆی ئەوە بڵاو دەبوونەوە کە عەرەبەکان منداڵ و ژنی ئەفریقییەکانی دارفور دەڕفێنن و وەک کۆیلە بەکاریان دێنن یان دەیانفرۆشنەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٨ دا ڕێکخراوێکی تایبەت بە دارفور بەناوی (کۆمەڵەی دارفور) لە راپۆرتێکی دوورودرێژی خۆیدا ئامارەی بۆ ئەوەکرد کرد ژمارەیەکی زۆری منداڵ و کچ و ئافرەتی دارفور لە لایەن هێزەکانی جەنجەویدەوە وەک کۆیلە دەکڕێن و دەفرۆشرێنەوە. ئەم گروپانە ڕۆلی سەرەکییان بینی لە فشار خستنە سەر ئەمەریکا،

لە ناوخۆی ئەمەریکا ١٧٥ ڕێکخراوی کۆمەڵگەی مەدەنی پێکەوە هاوپەیمانیی دارفۆر بپارێزن ( Save Darfur coalition) یان دروستکرد، ئەمانە هەر لە خۆپشاندان و ڕێکخستنی کۆنفرانسەوە تا دەگاتە بڵاوکردنەوەی کتێب و نامیلکە کاریان دەکرد، فشاریان دەخستە سەر حکومەت بۆ بەکارهێنانی هێز لە دژی حکومەتی سودان و توانیان کاریگەری زۆریان هەبێت لەسەر رای گشتی ئەمەریکا. وێڕای ناوخۆی ئەمەریکا هەمان ئەم ریکخراوانە لە نێوخۆی سودان و دارفوریش ڕۆڵی گرنگیان گێڕا لە راگرتنی کوشتاری حکومەتی سودان بەرامبەر بە خەڵکی دارفور.

ئامارە فەرمییەکانی حکومەتی سودان ئامارە بۆ ئەوە دەکەن کە ژمارەی ڕێکخراوە بیانییەکانی نێو دارفور لە ساڵی ٢٠٠٠ دا نزیکەی ٧٠ ڕێکخراو بووە، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٧ دا ژمارەیان بۆ سێ ئەوەندە زیادی کردووە. لە ساڵی ٢٠٠٧ دا ٢٥٨ ڕێکخراوی بیانی کە ١٥٨٠ فەرمانبەری

بیانی و ١٤٥٠٠فەرمانبەری ناوخۆ کاریان تێدا کردووە لە دارفوردا بوون، تەنها ئەمەریکا پتر لە هەزار فەرمانبەری لەم رێکخراوانەدا هەبووە، لە پاش ئەمەریکا هەریەکە لە فەرەنسا و بەریتانیا ( ١٠٠٠) فەرمانبەر و هۆڵەندا و سویسرا بە ریزبەندی دێن.
حکومەتی سودانیش لەکن خۆیەوە ئەم رێکخراوانەی بە جاسوسی ئەمەریکا و قوڵکردنەوەی گرفتەکان تاوانبار دەکرد،رێکخراوی NRC نەرویژی تاوانبارکرا بەوەی کە لە نێو چاردگاکاندا ئامۆژگاری پێشکەش بە پەنابەرەکان کردووە بۆ چۆنییەتی لێداوان و قسەکردن لە میدیاکانی خۆر ئاوادا، هەروەها راپۆرتی ساختەی ئامادە کردووە، چەندین رێکخراوی دیکەش لە سودان بە هەمان ئەم تۆمەتانە وەدەرنران.
لە رۆژی ٢٩ی مایسی ٢٠٠٤ وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی ئەمەریکا کۆڵن پاوەڵ سەردانی دارفوری کرد لە ساڵی ١٩٧٨ ەوە یەکەم سەردانی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکی بوو بۆ سودان.
ئەمەریکا لە نێو هۆڵەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو توانای خۆی بۆ ئەم کەیسە بەکار هێنا، لە راستیدا هەموو بڕیارەکانی ئەو رێکخراوە دژی سودان بە پێداگرتنی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی تێپەڕێنران، کە دەتوانین لەم بڕیارانەدا کورتیان بکەینەوە:
یەکەم: بڕیاری ١٥٥٦ لە ٣٠ تەموزی ٢٠٠٤، تایبەت بە چەکردنی جەنجەوید و دەستگیرکردنی سەرۆکەکانی و دادگایی کردنیان لە ماوەی ٣٠ رۆژدا، هەروەها بەپێ مادەی ٤١ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو دەوڵەتان دەبێت هیچ جۆرە پێداویستیەکی جەنگی نەدەن بە لایەنەکانی شەڕ.
دووەم: بڕیاری ١٥٦٤ لە ١٨ی ئەیلولی ٢٠٠٤، داوای جێبەجێکردنی

بڕیارەکانی ١٥٥٦ وێڕای ئەوەش ئامادەکردنی لیستێک لە ناوی تاوانباران و پێشکەشکردنی بە ڕێکخراوی یەکێتیی ئەفەریقا، بارودۆخی ئاڵۆز رابگرێت و کار بۆ ئاسایش و سەقامگیری ناوچەکە بکات لەم بڕیارەدا دوو شتی تازە هاتووە یەکەم داوای لە ئەمینداری گشتی کردووە کە لیژنەیەکی نێودەوڵەتی دروست بکات بۆ لێکۆڵینەوە لە پێشیلکردنی مافەکانی مرۆڤ و زیادکردنی چاودێرە نێودەوڵەتییەکانی مافەکانی مرۆڤ لە دارفور دووەمیش هەڕەشە لە هەنگاونان لە دژی کەسانی حکومەتی سودان دەکات.

سێیەم: بڕیاری ١٥٩٣ کەیسی دارفوری ڕەوانەی دادگایی نێودەوڵەتی کرد لە سەر بنەمای ئەو ڕاپۆرتەی کە پێشکەش بە نەتەوەیکگرتووەکان و سکرتێری گشتی کرا.

چوارەم: بڕیاری ١٧٠٦ لە ٣١ی ئابی ٢٠٠٦ بڵاوکردنەوەی هێزی ئاشتیپارێز کە ١٧٣٠٠ سەرباز و ٣٣٠٠ پۆلیسی مەدەنی بگرێتەوە ئەم هیزانە بۆیان هەبوو کە بەزۆر و بەهێز کارەکانیان ئەنجام بدەن .

پێنجەم: بڕیاری ١٧٦٩ لە ڕۆژی ٣١ تەموزی ٢٠٠٧ تایبەت بە پێکهێنانی هێزێکی هاوبەشی نەتەوەیەکگرتووەکان و یەکێتیی ئەفەریقا کە ١٩٥٥٥ سەرباز و ٦٤٢ پۆلیسی نێودەوڵەتی بگرێتەوە و ناوی نرا یونامید بۆ ئەوەی لە ڕۆژی ٣١ دیسێمبەری ٢٠٠٧ دا شوێنی (امیس) بگرێتەوە .

میسر:

میسر هاو سنورە لەگەڵ سودان، هەروەک لە سەرەتادا باسمانکرد، لە مێژووی کۆندا حوکمی فیرعەونەکان بۆ سودانیش درێژ بۆتەوەو چەندین هەرەمیشیان لە سوداندا دروستکردووە،لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویی هاوچەرخدا بەهاوبەشی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا سودانی بەڕێوە بردووە، میسریش هاوتای سودان دەوڵەتێکی ئەفەریقییە، سودان دەروازەی میسرە بۆ قولایی ئەفەریقا، بەشێک لە هۆزەکانی سودان کە هاوسنوری میسرن درێژکراوەی ئەتنیان هەیە لە ناو میسردا، هەروەها ئاوی نیل هاوبەشە نێوان ئەو دوو وڵاتەداو بەرژەوەندی ئەم دوو وڵاتەی پێکەوە گرێ داوە، بایەخدانی ئیسرائیل بە وڵاتە ئەفریقییەکان بۆتە هۆکاری ئەوەی کە بەرژەوەندی میسر لەگەڵ سوداندا زیاتر پێکەوە گرێ بدرێن ئەمەش بێگومان بەهۆی ململانێی عەرەب و ئیسرائیل.

دوو هۆکاری گرنگ وادەکەن کە میسر هەمیشە لێبڕاوانە چاوێکی لەسەر سودان بێت و لە وردو درشتی ئەو وڵاتە بکۆڵێتەوە، هۆکاری یەکەم ئاوی روباری نیلە و هۆکاری دووەمیش دەوڵەتی ئیسرائیلە کە میسر بە دوژمنی سونەتیی خۆی تەماشای دەکات.

دەوڵەتی ئەتیوبیا هەمیشە پاڵنەرێکی سەرەکی بووە بۆ ئەوەی میسر زیاتر هۆگری سودان بێت، هاوپەیمانی ئیسرائیل و ئەتیوبیا هەمیشە میسری ترساندووە، چونکە ئەتیوبیا جگە لەوەی پێگەیەکی ستراتیژی گرنگی هەیە لە ناوچەی (شاخی ئەفریقا) گرنگترین رێگای هاتوچۆی ئاویشی لە ناوچەکانی دەریای سورو ئۆقیانوسی هندی کۆنترۆڵ کردووە. وێڕای ئەوەش لقی سەرەکی روباری نیل ( نیلی شین

یاخود شینە نیل) کە ڕێژەی لانی کەم ٨٠٪ی ئاوی نیل پێکدێنێت، سەرچاوەکانی لە ئەتیوبیاوە هەڵدەقوڵێن، بۆیە ئەتیوبیا دەتوانێت هەمیشە سودان و میسر پێکەوە تەنگەتاو بکات، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە هەنگاوی تازەی حکومەتی ئەتیوبیایە لە دروستکردنی بەنداوێکی زۆر گەورە لەسەر روبارەکە کە تەنها ٤٠کلم لە سنوری سودانەوە دوورە، ئەم بەنداوە کە لە مارسی ٢٠١١ دەست بەکارەکانی کراوە، نەک تەنها هەڕەشەی ئاو لە سودان و میسر دەکات و ئاستی ئاوی نیل زۆر کەمدەکاتەوە بەڵکو لە ناوچەیەکی سنوری دروست دەکرێت کە هێشتا لە نێوان سودان و ئەتیوبیا ساغ نەکراوەتەوە.

ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە بوونی کێشەی قیبتییەکانی میسر دەبێتە هۆکاری ئەوەی میسر زیاتر بەتەنگ ئاسایشی نەتەوەیی سودانەوە بێت چونکە باشوری سودان کە سەربەخۆیی خۆیی ڕاگەیاند و کێشەی دارفوریش تاڕادەیەکی زۆر هاوشێوەن لەگەڵ کێشەکانی ناوخۆی میسر.

میسربەدرێژایی‌تەمەنی‌حکومەتی‌پێشوو (موبارەک)سەرسەختانەپشتوانی‌لە حکومەتی سودان دەکرد و دژی هەرجۆرە دەستوەردانێک لە کاروباری سودانەوە بەناوی کێشەی دارفورەوە دەوەستایەوە، بۆیە زۆر لێبڕاوانە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کاری بۆ دەکرد کە هیچ بڕیارێک لە بەرژەوەندی دارفورییەکان پەسەند نەکرێت، چونکە ئەمە سەروەری سودانی دەخستە بەر هەڕەشە، لە زۆربەی دانوستانەکانی نێوان حکومەتی سودان و یاخیبووەکاندا بە تایبەت دانوستانەکانی (لوتکەی ئەفریقی و لوتکەی لیبیا لە سرت) میسر ئامادەیی هەبوو، هەروەها پاش ڕەوانەکردنی هێزەکانی یەکێتیی ئەفریقا بۆ دارفور، چەند یەکەیەکی لە هێزەکانی خۆی لەگەڵ ئەو هێزانەدا ڕەوانەکرد.

# یەکێتیی ئەفریقاو مەسەلەی دارفور

یەکێتیی ئەفریقا رێکخراوی دەوڵەتە ئەفریقییەکانەو بایەخ دەدات بە بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانەو لە بابەتەکانی ئاسایش و بەرژەوەندی گشتی و ئاشتی و سەقامگیری ئەفەریقا رۆڵی تایبەتی هەیە، ئەم رێکخراوە کە ٥٢ دەوڵەتی ئەفەریقی (جگە لە مەغرب) ئەندامە تێیدا، ساڵی ٢٠٠٢ لە شوێنی رێکخراوی یەکگرتنی ئەفەریقا هاتە دامەزراندن. ئەم رێکخراوە لە کۆبونەوەی مانگی یۆلیۆی ٢٠٠٤ دا هەموو قورسایی خۆی بۆ کێشەی دارفور بەکارهێنا.

سیاسەتی یەکێتیی ئەفریقا زیاتر ئەوە بوو کە ئەم کەیسە لە چوارچێوەی ئەفریقا چارەسەر بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە داوای لە هەموو رێکخراوە نێودەوڵەتی و زلهێزەکانی دنیا کرد کە هاوکاریی مرۆیی پێشکەش بە دارفور بکەن و هەوڵەکانیان چڕبکەنەوە بۆ ئەوەی ئاشتی سەقامگیر بێت و گرفتەکە نەپەڕێتەوە بۆ ئەودیو سنوری سودان. هەروەها ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ ناردنی هێزی ئاشتی پارێز بۆ ناوچەکە. هەرچەندە حکومەتی سودان لە سەرەتادا هەرجۆرە پێشنیازێکی ئەو رێکخراوەی بۆ ناردنی هێز رەتکردەوە بەڵام لە کۆتایدا ناچار بوو مل بەو داوایە بدات، دیارە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و خودی ئەمەریکاش لەگەڵ ئەوەدا بوون کە هێزەکانی یەکێتیی ئەفەریقا لە ناوچەکەدا ئامادەبن و خۆشیان لە دوورەوە سەرپەرشتی بارودۆخەکە بکەن،

هەروەها یەکێتیی ئەفەریقا لە دانوستنەکانی نێوان سودان و هێزە یاخیبووەکانی دارفور رۆڵی گرنگی گێڕا بە تایبەت لە دانوستانەکانی ئەبوجا و پاشان لە سرتی لیبیا. دەتوانین بڵێین کە رۆڵی یەکێتیی ئەفەریقا وێڕای ئەوەی کە رێکخراوەکە هەژارو کەم دەسەڵات و کەم دەراسەت بوو بەڵام بەگشتی ئەو رۆڵە بە رۆڵێک ، میانگیریەکی باش باسی کرا.

## کۆماری چاد:

هەروەک لە سەرەتای ئەم نوسینەدا ئاماژەمان بۆ کرد، پەیوەندییەکی گرنگ دەوڵەتی چاد و دارفورییەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، رەنگە دەوڵەتی چاد تاکە دەوڵەت بێت کە راستەوخۆ ئەم گرفتەی بەخۆیەوە گرێ دابێت.

وێڕای ئەوەی کە دوڵەتی چاد هاوسنورە لەگەڵ دارفور، هۆزەکانیشیان هەمان درێژکراوەن و لەرووی ئاینی و ئەتنییەوە چونییەکن، هەر ئەمەش وایکردووە کە دەوڵەتی چاد هەمیشە راستەوخۆ لە نێو رووداوەکانی دارفوردا بووبێت، بەپێی زانیارییەکانی حکومەتی سودان و هەندێک زانیاری دیکەی سەربەخۆ، حکومەتی چاد لە بەرژەوەندی خۆی زانیوە کە بە چەک و تەقەمەنی و هاوکاری لۆجستی و تەنانەت بەشداری راستەوخۆ دەستی لە رووداوەکاندا هەبووبێت، ئەمەش لەپێناوی ئەوەی کە هاوسەنگییەک لە قازانجی هۆزەکانی دارفور بەدەست بێنێت. لە چەندین جەولەی دانوستانەکانیشدا چاد وێڕای ئەوەی کە میوانداری گفتوگۆکانی دەکرد رۆڵی گرنگی دەگێڕا لە ململانێکەدا. بەگشتی

سیاسەتی چاد بەرامبەر بە کێشەی دارفور لەوەدا بوو کە ئەگەر شەڕ بەردەوام بێت ئەوە دەبێت هاوسەنگی لە نێوان هێزەکاندا هەبێت و ئەگەر ئاشتیش بەرقەرار بێت ئەوە دەبێت بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتەش لەبەرچاو بگیرێت چونکە سەرەنجام سنورەکانی ئەو وڵاتەش پێویستی بە ئاشتی و سەقامگیری هەبوو.

## کۆماری نەیجریا:

نەیجریا هاوتای سودان و هاوتای زۆرێک لە دەوڵەتە ئەفریقییەکانی دیکە، چەندین جار نائارامی و کودەتاو یاخیبوونی ناوخۆیی بەخۆوە بینیوە، بۆیە نیگەرانی ئەم دەوڵەتە لە کێشەی دارفور لەوەدا بوو کە شەڕو نائارامی لە ناوەڕاست و خۆرئاوای ئەفەریقا کاریگەری راستەوخۆی دەبێت بۆسەر نەیجریا .

نەیجریا سنوری لەگەڵ سوداندا نییە بەڵام لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە کە باسمانکردن و لەبەر ئەوەی لە هەموو دەستێوەردانێکی دەرەکی لەم کەیسەدا دەترساو لە بەرژەوەندی خۆیدا بوو کە هەموو چارەسەرەکان لە رێگای یەکێتیی ئەفریقاوە بێت، چونکە خۆی هێزێکی گرنگی ئەو یەکێتییە بوو، لەم بوارەدا چ وەک بەشداری لە هێزە ئاشتی پارێزەکانی ئەفەریقاو چ وەک ئامادە بوون لە دانوستانەکاندا رۆڵی گرنگی گێڕاوە.

ئەریتریا:

سودان پاڵپشتی ئۆپۆزیسیۆنی ئەریتریای دەکرد، سەرهەڵدانی کێشەی دارفور باشترین هەل بوو بۆ ئەریتریا کە لەلایەک حکومەتی سودان لاواز بێت و سەرقاڵ بێت بە گرفتە زۆرەکانی خۆیەوەو لایەکی دیکەشەوە فشاری ئۆپۆزیسیۆن لەسەر خۆی کەم کاتەوە. وێڕای ئەوەی ئەریتریا سنوری لەگەڵ ناوچەی دارفوردا نییە و تەنها لەلای خۆرهەڵاتەوە هاوسێی سودانە، بەڵام بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی دوودڵ نەبوو لە پێشکەشکردنی هەر جۆرە هاوکارییەک بۆ دارفورییەکان، وێڕای ئەوەش ئەریتریا زیاتر لەبەرەی ئیسرائیل و ئەمەریکایە، ئەمەش بۆخۆی وادەکات کە بەشێوەیەکی خۆرسکانە ئەم وڵاتە پشتیوانی هەر جۆرە ئۆپۆزیسیۆن و بزوتنەوەیەک بێت کە ئەگەری لاوازکردنی دەوڵەتی سودانی هەبێت، بۆیە دەرگاکانی ئەم وڵاتە هەمیشە لەبەردەم ئۆپۆزیسیۆنی سودان ئاوەڵا بووە و لە ئەسمەرەی پایتەختی ئەو وڵاتەدا چەندین جار هێزە نەیارەکانی سودان پێکەوە رێکەوتنی هاوبەشیان مۆر کردووە.

حکومەتی سودان هەمیشە ئەریتریای بە دەستێوەردان لە کاروباری سودان تۆمەتبار کردووە، هۆکاری ئەمەش بۆ هاندانی ئیسرائیل و ئەمەریکا دەگەڕێنێتەوە، هەندێک جاریش هەڕەشەی لە حکومەتی ئەسمەرەکردووە کە ئەگەر بێتو واز لە هەنگاوە دوژمنکارانەکانی خۆی نەهێنێت ئەوە ئەگەر سودان لەو نیو ملیۆن هاوڵاتییە ئەریترییایانەی کە لە ناو سوداندا دەژین تەنها دەهەزار کەسیان چەکدار بکات ئەوە دەتوانێت ئەسمەرەش بگرێت، سودان چەندین جار لە رێگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە سکاڵای لە دژی ئەریتریا تۆمارکردووە.

## کۆماری سەنترالّی ئەفەریقا:

بەهۆی هاوسنوریی ئەم وڵاتە لەگەڵ دارفورو بوونی پەیوەندی هۆزایەتی و خوێن و ئەتنی لەنێوان پێکهاتەکانی هەردوولا، هەر جۆرە نا ئارامی و جەنگ و پشێوییەک کاریگەری خراپی دەبێت بۆ سەر ئەو وڵاتە، بەتایبەت ئەگەر زانیمان ئەو وڵاتەش بۆ خۆی بەدەست چەندین کێشەی ناوخۆوە دەناڵێنێت و چەندین جاریش کودەتای سەربازی و یاخیبوونی تێدا ئەنجامدراوە. کۆماری سەنترالّی ئەفریقیا بە هیچ شێوەیەک لەبەرژەوەندیدا نەبوو کە ناوچەیەک بەتاڵ بێت لە دەسەڵاتی حکومەت و ببێتە پەناگەیەکی ئارامیش بۆ نەیارەکانی خۆی بۆیە هەمیشە هەوڵیداوە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سوداندا جێگیرو چەسپاو بکات و کێشەی دارفوریش بە شێوەیەکی ئاشتیانە بەبێ دەستێوەردانی لایەنە بێگانەکان چارەسەر بکرێت.

کام لە یاسا نێودەوڵەتییەکان بەسەر کەیسی دارفوردا دەچەسپێن؟

ئەو راپۆرتەی کە نێرژەی تایبەتی نەتەوە یەککگرتووەکان سەبارەت بە کەیسی دارفور ئامادەی کردو پێشکەش بە ئەمینداری گشتی کردووە، ئاماژە بە چەندان یاسای گرنگی نێودەوڵەتی دەدات لە کەیسی ناوبراودا:

یەکەم: یاسای نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ.

سودان چەندین پەیمانی نێودەوڵەتی واژوو کردووە، کە هەموویان تایبەتن بە مافەکانی مرۆڤ، لەوانەش پەیمانی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان، پەیمانی تایبەت بە مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، پەیماننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بە نەهێشتنی

ڕەگەزپەرستی، هەروەها پەیمانی تایبەت بە مافەکانی منداڵ بەڵام سودان تایبەت بە مافەکانی منداڵ بڕگەی بەشدارییپێکردنی منداڵانی لە شەڕو ململانێی چەکدارانەدا پشتڕاست نەکردۆتەوە، هەروەها سودان ڕێکەوتننامەی قەدەغەکردنی کۆمەڵکوژی و ئەشکەنجەی مۆر نەکردووە، وەلێ لە سەر ئاستی هەرێمایەتی سودان پەیمانی ئەفریقی مافەکانی مرۆڤ و مافی گەلانی مۆرکردووە. سەبارەت بە یاسای نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ ئەوەی پەیوەست بێت بە کەیسی دارفورەوە ئەم بڕگانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

- مافی ژیان، ئەشکەنجە، لێدان، مامەڵەی خراپ و نامرۆڤانە، دەستبەسەرکردنی مرۆڤ، زیندانی کردنی، مافی ئازادی هاتوچۆ و گواستنەوە، مافی موڵکایەتی، مافی ژیان لەشوێنێکی شیاودا، ڕانەگواستن بەزۆر، مافی تەندروستی و ساغلەمی، مافی بەدەستهێنانی خواردن و خواردنەوە، مافی دادگاییەکی دادپەروەرانە. هەموو جۆرە پێشێلکارییەک لەم بوارانە دژی یاسا نێودەوڵەتییەکانن و دەبێت ئەنجامدەرانی سزا بدرێن و بخرێنە بەردەمی دادگاو زیانلێکەوتوانیش قەرەبوو بکرێنەوە.
- یاسای نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ چەندین کۆڵەکەی تایبەتی سەبارەت بەم مافانە لەخۆگرتووە، بۆ نمونە لە حاڵەتی ناکاودا مادەی چوارەم لەم یاسایە جەخت لەوە دەکاتەوە کە بۆ ڕاگەیاندنی باری نائاسایی دەبێت دوو مەرج لە گۆڕێدا بێت، مەرجی یەکەم ئەوەیە کە حاڵەتێکی نائاسایی ڕاستەقینە هەبێت هەڕەشە لە ژیانی هاوڵاتییان بکات، مەرجی دووەم ئەوەیە کە ئەو بارە نائاساییە بەپێی دەستور و یاسا دیاری بکرێت و لە ڕێگای ئەمینداری گشتی نەتەوە

یەکگرتووەکانەوە دەوڵەتانی دیکە لەم هەنگاوە ئاگادار بکاتەوە، لە هەمان مادەی چوارەمدا یاساکە ڕێگا لە دەوڵەت دەگرێت کە لەژێر ناوی باری نائاسایدا مافی ژیان وەرگرێتەوە (واتە کوشتن ئەنجام بدات) یاخود ئەشکەنجەو سزای نامرۆڤانە و زیندانی کردن و کوێلەکردن ئەنجام بدات، یاخود ئازادی ئاین و بیروباوەڕ پێشێل بکات

- ئەو ڕەگەزانەی دیکە، کە لەنێو ئەم یاسایەدا ئاماژەی بۆ کراوەو ڕێگا بە پێشێلکردنی نادرێت ئەوەیە کە پێویستە لە بارە نائاساییەکاندا ( جەنگ و کوشتارو ململانێی ناوخۆیی) مامەڵەی نامرۆڤانە بەرامبەر بە کەس نەکرێت و کەرامەتی مرۆڤەکان پارێزراو بێت، نابێت هیچ کەسێک وەک بارمتە دەستبەسەر بکرێت یاخود بڕفێنرێت، ڕاگواستن، دەرکردن، کۆچپێکردنی بەزۆر، پڕوپاگەندە بۆ جەنگ، بانگەشەی ڕەگەزپەرستی و ڕق و جیاکردنەوەی ڕەگەز و توندوتیژی، هەر هەموو ئەم کارانە دەچنە نێو چوارچێوەی بڕگەی ٣ لەمادەی دووەمی یاساکە و ئەنجامدەرانیشی سزا دەدرێن و دەخرێنە بەردەم دادگا.
- دەستەبەرکردنی مافی سکاڵاکردن و وەرگرتنەوەی وەڵام و دابینکردنی پارێزگاری پێویست بۆ کەسانی هەڕەشە لێکراو.

دەوڵەتی سودان لەساڵی ١٩٩٩ دا باری نائاسایی ڕاگەیاند و لە ساڵی ٢٠٠٤ دا سەرلەنوێ تازەی کردەوە، بەڵام حکومەتی سودان بەرامبەر بەو بڕگانەی سەرەوە هیچ هەنگاوێکی پێویستی نەناوە و ڕێزی پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان و هەرێمایەتییەکانی نەگرتووە.

دووەم: یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی.

یاسای مرۆیی نێو دەوڵەتی هەرچوار پەیمانەکەی جنێف لە ساڵی

١٩٤٩ دەگرێتەوە، هەروەها پەیماننامەی ئۆتاوای تایبەت بە بەرهەمهێنان و چاندنی مینی زەوی و هەردوو پرۆتۆکۆلی ساڵی ١٩٧٧ دەگرێتەوە، هەرچەندە سودان ئەم رێکەوتنانەی مۆرکردووە، بەڵام لە نێو چوارچێوەی دەستور و یاساکانی ناوخۆیدا نەیچەسپاندوون، بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان ئەو دەوڵەتە دەبێت خۆی بەو پەیمان و رێکەوتنانەوە ببەستێتەوەو هیچ شتێک ناکرێتە پاساو بۆ خۆدزینەوە لێیان.

پارێزگاریکردن لە خەڵکی سڤیل و شوێنە سڤیلەکان و مامەڵەکردنی بریندارەکان و دیلەکانی شەڕو چاودێری نەخۆش و پەککەوتووەکان وخۆبەستنەوە بە یاساکانی ململانێی چەکدارانەی ناوخۆ، بڕگەی گرنگی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتین، وێڕای ئەمانەش دەیان بڕگەی دیکەی تایبەت بە پاراستنی شوێنە سڤیلەکان و شوێنە گشتییەکانی وەک نەخۆشخانە و قوتابخانەو مۆزەخانەکان وپەرستگا و شوێنە فەرهەنگییەکان و پابەند بوون بە هێرش نەکردنە سەر ئەو ئۆتۆمبێل و رەوڕەوانەی کە بۆ گواستنەوەی بریندار و کوژراوەکان بەکاردێن .هتد لەم یاسایانەدا داڕێژراون.

پاش هاتنە گۆڕیی پرۆتۆکۆلی رۆما (١٩٩٨) کە سودان و ١٢٠ دەوڵەتی دیکە مۆریان کردووە، پێشێلکردنی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی وەک تاوانی جەنگ پۆلێن دەکرێت.

بەپێی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتی سێ جۆر تاوانی سەرەکی پۆلێن کراون:

یەکەم: تاوانی جەنگ پێشێلکردنی یاسای مرۆیی نێودەوڵەتییە، جا ئایا ئەو پێشلکردنە لە جەنگی نێو دەوڵەتیدا بێت یاخود لە جەنگی

ناوخۆدا بێت. لەم بارەدا بەرپرسیارییێتی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسەی کە تاوانەکە ئەنجام دەدات.

دووەم: تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی ئەم تاوانانە دەرهەق بە کۆمەڵیک خەڵک دەکرێت وەکو کردەوەکانی کوشتن، لەناوبردنی بە کۆمەڵ، کۆیلەکردن، گواستنەوەی بەزۆر، ئەشکەنجەدان، لاقەکردن.

سێیەم: تاوانی جینۆساید: له یەکێک له دەقە تایبەتەکانی پرۆتۆکۆلی رۆما لە ١٩٩٨ کە پاشان لە چوارچێوەی دادگای تاوانی نێودەوڵەتیدا ساڵی ٢٠٠٢ هەموارکرایەوە برگەیەکی سەربەخۆ بەمجۆرە ئەم تاوانە پێناسە دەکات: مەبەست لە تاوانی کۆمەڵکوژی هەرجۆرە کردەوەیەکە لەم کردەوانەی خوارەوە، کە بە مەبەستی قەلاچۆکردنی کۆمەڵێکی ئاینی یاخود نەتەوەیی یاخود رەگەزێک یاخود ئێتنییەک بێت، جا ئایا قەلاچۆکردنەکە تەواوبێت یاخود نیمچە قەلاچۆکردن بێت:

- کوشتنی بەکۆمەڵی ئەندامانی.
- زیان گەیاندنی فیزیکی یاخود ئەقڵی بە ئەندامانی.
- سەپاندنی بارودۆخێکی بژێوی قورس و گران بەسەریاندا بە مەبەستی لەناوبردنیان بە شێوەیەکی تەواو یان نیمچە تەواو.
- ئەنجامدانی هەندێک رێوشوێن بۆ رێگەگرتن لە زاوزێ و منداڵ خستنەوە.
- گواستنەوەی بەزۆری منداڵان ودزین و بەخشینیان بە خەڵکانی دیکە.

بەمجۆرە سەرنج دەدەین کە تاوانی قەڵاچۆکردنی بەکۆمەڵی ساڵی ١٩٤٨ و هەموو برگەو بریارەکانی دیکەی وابەستە بە هەمان بابەت

جەخت لەسەر پێداویستی بوونی دوو کۆڵەکەی سەرەکی دەکاتەوە لەم جۆرە تاوانانەدا کە ئەوانیش کۆڵەکەی مادی و مەعنەوین. کۆڵەکە مادیەکە هەموو ئەو شێوازانە دەگرێتەوە لە قەلاچۆکردن کە ئاماژەمان بۆ کرد، کۆڵەکەی مەعنەویش مەبەست و ئامانجی قەڵاچۆکردنەکەو شێوەی رەفتاروبەرنامەی ئەنجامدانەکەی دەگرێتەوە.

ئایا ئەو تاوانانەی لە دارفور ئەنجامدراون دەچنە چوارچێوەی قەلاچۆکردنی بە کۆمەڵەوە؟ بێگومان زۆرێک لە بنەماکانی قەلاچۆکردن وەک کوشتن و ئازاردانی فیزیکی و دەرونی و ئاوارەکردن لەم پرۆسانەدا ئەنجام دراون بەڵام دوو رەگەز لە رەگەزەکانی پاکتاوکردنی بەکۆمەڵ پێویستی بە هەڵوەستەی زیاتر دەکات، ئەوانیش ئەوەن کە داخۆ ئەو کۆمەڵانەی رووبەڕووی پاکتاوکردن دەبنەوە دەچنە نێو چوارچێوەی پاراستنی نێودەوڵەتی؟ داخۆ ئەو تاوانانە بە ئامانجی پاکتاوکردنی نەژادی ئەنجام دراون؟

١ - هۆزەکانی ( الفور، المسالیت، الزغاوة) گروپگەلێکی ئەتنی جیاوازنین لەوانەی کە هێرشەکان دەکەنە سەریان، ئەوان هەمان زمان ( عەرەبی) بەکاردێنن و هەمان ئاین ( ئیسلام) پەیڕەو دەکەن، هەروەها لەنێو ئەو هۆزانەدا بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە جۆرێک لە تێکەڵاوی هەیە.

٢ - لەم ساڵانەی دوایدا لەگەڵ توند بوونەوەی قەیرانەکاندا، پرسی ناسنامە زیاتر قوڵ کرایەوە، لەناو هۆزەکاندا دووبەرەکی و کەرت بوون سەریهەڵدا، هۆزەکانی دژ بە دەسەڵاتی ناوەند وەک هۆزە ئەفریقییەکان ناسران و هۆزە لایەنگرەکانی حکومەتیش وەک هۆزە عەرەبییەکان. بەڵام ئەوەی لەم پۆلێنکردنەدا جێگەی سەرنجە ئەوەیە

که هەموو هۆزە ئەفریقییەکان لەگەڵ یاخیبووەکاندا نین و هەموو هۆزە عەرەبییەکانیش لەگەڵ حکومەتدا نین، بۆ نمونە هۆزی ( الجمیر)ی ئەفریقی لەگەڵ حکومەتدان، هەر بەو هۆیەشەوە لەلایەن هۆزەکانی دیکەوە بە تەعریب کراو ناودەبرێن.

٣- هۆکاری دیکەش هەن بۆ تیژبوونەوەی ململانێکان، بۆنمونە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا هێرشبەرە عەرەبەکان بۆ پاساودانی هێرشەکانیان پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی هەندێک زارەوەی وەک ( کۆیلە، پێست رەش، زنجی، قولەرەش) کەئەمەش دەبێتە هۆکارێک بۆ کوشتن لەسەر رەگەز، لەبەرامبەر ئەمەشدا هۆزە ئەفریقییەکان هێرشبەرە عەرەبەکان بە جەنجەوید (چەتە) ناو دەبەن.

بەڵام سەبارەت بە کۆڵەکەی مادی ئەوە دەبێت بزانین کە داخۆ مەبەست و ئامانجی پاکتاوکردنی نەژادی لەم کەیسەدا بوونی هەیە یان نا، ئەوا لە هەندێک حاڵەتدا بەتەواوی هەست بە بوونی ئەو تاوانە دەکرێت کە بە مەنهەج و بەرنامە کاری قەلاچۆکردن و رووداوی ترسناک ئەنجام دراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک ئاماژەی دیکە هەن کە دژی ئەمە دەوەستنەوە لەوانەش :

ئەلف- لە هەندێک لە هێرشەکاندا تەواوی دانیشتوانی ئەو گوندانەی هێرش کراوەتە سەریان لەناو نەبراون، بەڵکو بۆ نمونە لە هێرشی رۆژی ٢٢-١-٢٠٠٤ دا بۆ سەر ٢٥ گوند کە ژمارەی دانیشتوانەکەی یازدەهەزار کەس بوون لە ئەندامانی هۆزی فور لە دەشتی صالح، هێرشبەرەکانی جەنجەویدو حکومەت لەنێو ئەو کەسانەی کە مابوونەوە تەنها ١٥ کەسیان بە شێوەیەکی رەمەکی کوشتووە، هەروەها هەموو دیلەکانیان لە گوندەکانی دیکەدا کۆکردۆتەوەو ٢٠٥ کەسیان بە تۆمەتی

ئەندامیێتی لە رێکخراوە یاخیبووەکاندا لێکوشتوون و ٨٠٠ کەسی دیکەیان لە زیندانی (موکجار) هێشتۆتەوەو پاشان ئازادیان کردوون.
بێ- ئاوارەکان بە گشتی لە چەندین کامپی تایبەتدا کۆ دەبوونەوە، هەوڵی ئەوە لە گۆڕیدا نەبووە کە ئەو خەڵکانە لەنیو ئەو کامپانەدا بکوژن بە مەبەستی پاکتاوکردنیان، حکومەت بە ناچارکردنی ئەو خەڵکە بە کۆچپێکردنی زۆرە ملەو روخاندنی گوندەکانیان بنەماکانی مافی مرۆڤ و یاسای تاوانکاری نێودەوڵەتی پێشێل کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رێگای بە رێکخراوەکان داوە هاوکاری پێشکەش بە پەنابەرەکان بکەن.
جیم- بە پێچەوانەی حاڵەتەکانی دیکەوە لە هەندێ شوێنی دارفور هێرش نەکراوەتە سەر هەندێ مەڵبەند کە تێکەڵاوێک لە هۆزە عەرەبی و ئەفریقییەکان پێکەوە دەژین وەک گوندی ( اباتا) لە باکوری خۆرهەڵاتی (زالنجی).
لیژنەی نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوە لەم کەیسە لەسەر بنەڕەتی رووداوەکان گەیشتە کۆمەڵێک دەرەنجام لەوانەش:
یەکەم- حکومەت سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی نەگرتۆتەبەر، سەرباری ئەوەی کە دوو کۆڵەکەی مادی و مەعنەویی گرنگی ئەم سیاسەتە لە رەفتارەکانی حکومەت و میلیشیاکانی جەنجەوید بەدی دەکرێن.
دووەم- بەشێوەیەکی گشتی لەم دواییانەدا ململانێی دارفور شێوەی ململانێی نێوان هۆزە ئەفریقی و هۆزە عەرەبەکانی لە خۆدا بەرجەستە کردووە، بەڵام لانی کەم سەبارەت بە حکومەت رەگەزێکی گرنگ کە

بریتییەلە پاکتاوکردنی نەژادی بوونی نییە، ئاماژەکان ئەوە نیشان نادەن کە سیاسەتێکی ئانقەستی حکومەت لە ئارادا بێت بۆ پاکتاوکردنی نەژادی، سیاسەتێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو لە لایەن حکومەتەوە بە مەبەستی قەلاچۆکردن و پاکتاوکردنی کۆمەڵێکی ئاینی یان نەتەوەیی یان ئەتنی بوونی نییە.
ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەموو ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان (NGO)، یەکێتیی ئەفریقا و یەکێتیی ئەوروپاش هەتا ئێستا مۆرکی جینۆسایدیان بە مەسەلەی دارفور نەبەخشیوە، بۆچوونی هەموویان لەو خاڵەدا کۆکە کە دەڵێت بەرنامە بۆ لەناوبردنی گروپێکی ئەتینی دیاریکراو بوونی نەبووە، کۆفی ئەنان سکرتێری پێشووی نەتەوە یەکگرتووەکانیش هەمان بۆچوونی هەیە ئەو لەو باوەڕەدایە کە وێڕای ئەوەی کوشتارگەلەکانی دارفور زۆر سامناک و خوێناوی و دژ بە هەموو بەهاو پرەنسیپە یاساییە نێودەوڵەتییەکانە بەڵام ناچنە نێو چوارچێوەی جینۆسایدەوە.
سێیەم- حکومەت ئامانجی دەرکردنی کۆمەڵێکی دیاری کراوی ئەتینی هەبووە لە ناوچەیەکدا، ئەمەش بەمەبەستی سیاسی، بۆ ئەم خاڵەش چەندین بەڵگە و نمونەی زۆر لەبەر دەستدان. هێرشە مەنهەجی و بەردەوامەکانی حکومەت و میلیشیاکانی جەنجەوید بۆ سەر ناوچەکان و ئەنجامدانی کردەوەکانی کوشتن و دەرکردن و ئەشکەنجەدانی خەڵکی سڤیل و سوتاندن و خاپورکردنی گوندەکان و دەستگرتن بەسەر مەڕوماڵاتیاندا، هەموو ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەنجامدانی تاوانی دژ بە مرۆیی و تاوانی جەنگ، بەڵام ئەمانە هەمووی ناکۆک نابن لە گەڵ ئەو خاڵەی لیژنەکە کە دەڵێت حکومەت سیاسەتی پاکتاوکردنی نەژادی ئەنجام نەداوە.
چوارەم - لیژنەکە ئەوەی بەدوور نەزانی کە لەنێو دەسەڵاتدارانی

حکومەت و میلیشیاکاندا خەڵکانێک هەبووبن نییەتیان ئەنجامدانی کاری پاکتاوکردنی نەژادی بووبێت، بۆیە لەم حاڵەتەدا هاوتای کەیسەکانی رواندا، دادگای تاوانی نێودەوڵەتی ئەو کەیسانە سەربەخۆ تەماشا دەکات، بۆیە لە حاڵەتی بوونی بەڵگەی لەو جۆرەدا دادگای نێودەوڵەتی ئەو کەسانە دەباتە بەردەم یاسا.

## رەوشی مرۆیی لە کەیسی دارفوردا

رۆژی ٢٢-٤-٢٠٠٤ نێرژەیەکی سەر بە رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ ماوەی دە رۆژ لە ناوچەی دارفور بەدوواداچوونی بۆ ئاست و جۆری پێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ ئەنجامدا، لە کۆتایدا راپۆرتێکی لە دووتوێی ١٨ لاپەڕەدا بەرزکردەوە، خانم (منی رشماوی) راوێژکاری یاسایی لە کۆمیسیۆنی باڵای مافەکانی مرۆڤ (سەرۆکی بەشی سەروەری یاساو یەکسانی و نەهێشتنی رەگەزپەرستی لە ئێستادا) بەرپرسی نێرژەکە بوو، ئامارەی بۆ کردەوەکانی لاقەکردنی منداڵانی ١٣ ساڵان کرد لە لایەن میلیشیاکانی جەنجەویدەوە، کە تەنانەت هەتا کامپەکانی سنوری چاد لە کۆڵیان نەبوونەتەوە، حکومەتی سودانیش بیانوو بۆ ئەوە دەهێنێتەوە کە هەندێک لە هۆزەکان پشتیوانییان لە حکومەت کردووە بۆ تێکشاندنی یاخیبووەکان، هەروەک چۆن وەزیری دەرەوەی سودان لە کۆنگرەی جنێڤ باسی کرد.

جێگری نوێنەری تایبەتی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری سودان و ڕێکخەری نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری مرۆیی لە راپۆرتی ( کورتەی پێداویستییە مرۆییەکانی دارفور- مانگی نۆڤێمبەری١٩٩٤ ) بەمجۆرە رەوشەکە باس دەکات:

یەکەم: کۆی ئەو کەسانەی لە کێشەی دارفوردا زیانیان وێکەوتووە بە ٢.٢٧ ملیۆن کەس مەزەندە کراوە، ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە سێ بەشی ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە بەر لە تیژبوونەوەی ململانێ ٦.٣ ملیۆن کەس بوون، زیانیان وێکەوتووە. کۆی گشتی پەراگەندەو ئاوارەو دەربەدەرکراوەکانیش ١.٦٥ ملیۆن کەس دەبێت، ژمارەی ئەو کەسانەی کە ئاژانسەکانی هاریکاری مرۆیی دەیتوانی دەستی هاوکارییان بۆ درێژ بکات ٦٢٧ هەزار کەس بووە.

دووەم: لە تەواوی ناوچەی دارفور ١٠١ پێگەی گشتی بۆ داڵدە دانی ئاوارەکان لە گۆڕێدا بووە کە زۆربەی هەرە زۆریشیان چادرگا بوون، لەوانەش ٢٢ لە باکوری دارفور، ٤٢ لە باشور، ٣٧ لە خۆرئاوا، هەندێک لەو چاردگایانە نزیکەی ٧٠ هەزار کەسی تێدا بووە، هەندێکیشیان زۆر بچوک و چەند هەزار کەسێکی تێدا بووە.

سێیەم: ڕێپێدراوی گشتی دەستەی هاوکارییە مرۆییەکانی حکومەتی سودان لە رۆژی ١٢-١-٢٠٠٥ دا ژمارەی ئاوارەکانی ناوخۆی بە ١.٦٥١ ملیۆن کەس ناوبرد کە لە ٨١ چاردگادا بوون، هەروەها ئەوەشی راگەیاند کە نزیکەی ٤٠٠ هەزار ئاوارە گەڕاونەتەوە بۆ زێدی خۆیان. ئەم ژمارانە هەرگیز نەتوانرا لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پشتڕاست بکرێتەوە.

چوارەم: ژمارەی خەمڵێنراوی ئەو کەسانەی بەهۆی ململانێی دارفورەوە

زیانیان وێکەوتووە، بە ژمارەی ئەو پەنابەرانەی کە لە وڵاتی چاد دەژین ١.٦٥ ملیۆن ئاوارەن (بەپێی راپۆرتی ساڵی ٢٠٠٧ ی رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ ٢٠٠ هەزار پەنابەر لە وڵاتی چاد دەژین) و ٦٢٧ هەزار کەسیش بەشێوەیەک لە شێوەکان زەرەرمەند بوون ژمارەی هەموو ئەمانە بۆ نزیکەی ٢.٥ ملیۆن کەس بەرز دەبێتەوە. هەروەها بەپێی زانیارییەکانی کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ ٤.٧ ملیۆن کەس لە ساڵی ٢٠٠٩ دا پێویستیان بە هاوکاری مرۆیی هەبووە.

لە ئێستادا نزیکەی دوو ملیۆن کەس دەربەدەر بوون و لە چادرگەو شارەکاندا دەژین و بەشێوەیەکی تەواوەتی لەسەر هاریکاری مرۆیی دەژین، ئەمانە لەبەر بەردەوامی هێرشەکان و کردەوەکانی کوشتن و لاقەکردن و چەتەگەری لەلایەن میلیشیاکانی جەنجەوید کە حکومەت پشتیوانییان دەکات، ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان.

## ئەو پێشێلکارییانەی کە ئەنجام دراون

یەکەم- هێرشی هەڕەمەکی:

لیژنەکە لە راپۆرتەکانی خۆیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هێزەکانی حکومەت و میلیشیاکانی جەنجەوید بەتەنهاو پێکەوە هێرشەکانیان ئەنجامداوە، یاخیبووەکانیش لەلایەن خۆیانەوە چەندین هێرشیان ئەنجامداوە، بەڵام

بەشێوەکی گشتی ئەم هێرشانە بۆ سەر ئامانجە سەربازیەکان بووەو لە هەندێک سنوری دیاریکراویشدا سڤیلەکان کراونەتە ئامانج. جۆری پێشێلکارییەکانیش بەم شێوەیە پۆلێن دەکات:

هێرشی هێزەکانی حکومەت و میلیشیاکانی جەنجەوید:

بەپێی ئەو زانیارییانەی کە رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە سەرچاوە تایبەتەکانی خۆیەوە ( ئاشکرا و نهێنی) دەستی کەوتوون، سەرەتای هێرشەکانی حکومەتی سودان و میلیشیاکانی جەنجەوید بۆ سەر هەرێمی دارفور لە سالّی ٢٠٠١ دا بووە، پاشان بەردەوام بووە و سالّ لە دوای سالّ و جار لە دوای جار توندتر وخوێناویتر بوون.

لیژنەکە گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە زۆربەی هەرە زۆری هێرشەکان لە هەریمی ناوبراودا لە لایەن هێزەکانی حکومەت یاخود جەنجەوید یاخود هەردوکیان پێکەوە ئەنجام دراون. زۆربەی هێرشەکان کازیوەی بەیان لە نیوان کاتژمێر ٤:٣٠ و ٨:٠٠ دا ئەنجام دراون، لەو کاتانەدا خەلّکی ئەو گوندانە بەشی هەرە زۆریان لە نێو جێگادا بوون و هێرشی لەناکاو کراوەتە سەریان.

بەدرێژایی ماوەی ململانێکان گوندەکانی ناوچەی دارفور ئامانجی هێرشەکان بوون، لە پێشدا سەربازەکانی سوپای سودان بە ئۆتۆمبێلی لاندکرۆزو چەندین جۆری دیکەی رەوڕەوەی سەربازی هێرشیان دەستپێدەکرد، پاشان لە دوای ئەمان کۆمەلّێکی زۆر لە جەنجەویدەکان بە سواری ئەسپ و حوشترەوە ئامادە دەبوون، جۆری ئەو چەکانەی کە بەکار هێنراون بریتیبوون لە ( کلاشنکۆف یاخود AK٤٧، هەروەها تفەنگی ژێ سێ G٣ و هاوێژەرەکانی وەک ئاربی جی (RBG) .

بەهۆی ئەم هێرشانەوە خەلّکانێکی سڤیل لە ژنان و مندالاّن و پیرو

پەککەوتوان بوونە ئامانج و بیرەکانی ئاو کوێرکرانەوەو خانووبەرەو قوتابخانەو نەخۆشخانە و دوکان و بازاڕەکان سوتێنران، دزیکردن و دەستبەسەراگرتنی مەڕومالات و رەشەولاخ ئەنجامداران. هاوکات لەگەڵ ئەم هێرشانەدا تۆپبارانکردن و بۆردومانکردنی بەردەوام و ڕێکوپێک ئەنجامدراون، لیژنەکە بەڵگەی تەواوی لە دەستایە کە فرۆکەی هێلیکۆپتەر لە جۆری (MI۸-MI۲٤) و ئەنتینۆف لەم هێرشانەدا بەشدار بوون، پاڵپشتی ئاسمانی فرۆکەکان لە هێرشەکانی جەنجەوید بەڵگەی تەواوی پەیوەندی حکومەتە بەو میلیشیایەوە. بەشی هەرە زۆری ئەم هێرشانە بۆ سەر هۆزە ئەفریقییەکانی دارفور ئەنجام دراون. پرسیارێکی دووبارە لە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی زیان لێکەوتووی دارفور کراوە، ئەویش ئەوەیە ( بۆچی حکومەتی سودان و جەنجەوید دێنە سەرتان؟) هەموو وەڵامەکان جەخت لەسەر راستییەک دەکەنەوە (دەیانەوێت دەست بەسەر ماڵ و موڵک و زەوی وزارو ئاژەڵەکانماندا بگرن) یاخود (دەیانەوێت لێرە نەمێنین و چۆڵی کەین بۆیان). هێرشکارانیش لە کاتی ئەنجامدانی هێرشەکانیاندا بەردەوام ئەم قسانەیان لە شێوەی دروشمدا گوتۆتەوە:

( ئێوە تۆرا بۆران، هۆزەکانی فور کۆیلەن و ئێمە دەیانکوژین، هاتوین رەش پێستەکان بەتەواوی لەناو بەرین، ئەم زەویانە موڵکی ئێوە نین، ئێوە خەڵکی ئەم شوێنە نین، ئێوە تەنها کۆیلەن و دەبێت خاوەنتان هەبێت).

کاتێک میلیشیا چەکدارەکانی سەر بە حکومەت، لە هێرش و کوشتارەکاندا بەشداری دەکەن، ئەمە خۆی ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو هێزانە لەژێر دەسەڵات و فەرمانی راستەوخۆی حکومەتدان و

بەپێی فەرمانەکانی حکومەت ئەو کارانە دەکەن، بۆیە هەموو بەرپرسیاریێتییەک لە ئەنجامدانی ئەو تاوانانە بە تەنها ناکەوێتە سەر میلیشیاکان و ئەو سەرۆک میلیشیایانەی کە ئەو کارانەیان ئەنجامداوە بەڵکو بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان بەرپرسیاریێتی سەرەکی وێڕای تاوانباران دەکەوێتە سەر دەوڵەتی سودان.

## هێرشی هێزە یاخیبووەکان :

هێرشی هێزە یاخیبووەکان لە زۆرترین حاڵەتدا بۆ سەر ئامانجە سەربازییەکان ئەنجام دراون، بۆ نمونە لە خۆرئاوای دارفور لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣ دا هێرشیان کردۆتە سەر بنکەیەکی پۆلیس لە (تنگافوتا)، لە باشوری دارفوریش لە ژانیوەی ٢٠٠٤ دا هێرشیان کردۆتە سەر بنکەکانی پۆلیس و حکومەت، لە باکوریشدا بەهەمان شێوە هێرشیان کردۆتە سەر بنکەکانی پۆلیس و ٢٨ پۆلیسیان کوشتووە، زۆربەی ئەم هێرشانە لەلایەن سوپای رزگاری سودانەوە یان بە هاوبەشی لەگەڵ بزوتنەوەی دادپەروەری و یەکسانی ئەنجام دراون.

ئەم هێرشانە بەدەر نەبووە لە زیانگەیاندن بە هاوڵاتیانی سڤیل، بۆ نمونە لە رۆژی ٤-١٠-٢٠٠٣ دا بزوتنەوەی دادپەروەریی و یەکسانی بەبەرگی سەربازی بەڵکەوە، هەندێک لە چەکدارەکان بەسواری ٣٥ ئۆتۆمبیلی لاندکرۆزەوە و هەندێکی دیکەشیان بە بەرگی سڤیلی ئاساییەوە بە سواری ئەسپ و حوشتر، هێرشیان کردۆتە سەر ناوچەی (کلبص)، جۆری ئەو چەکانەی لەم هێرشەدا بەکاریانهێناوە بریتیی بووە لە کلاشنکۆف، فراتوف، تفەنگی GM٤، رۆکێتی کاتیۆشا، هاوەنی ١٠٦ و ١٢٠. لەم هێرشەدا وێڕای

کوژرانی ٤٢ سەرباز ١٧ کەسی سڤیل لە رەگەزی نێرو یەک منداڵێش کوژراون.
یاسا نێودەوڵەتییەکان رێگا نادات لە ژێر هیچ پاساوێکدا هێرشی بە ئانقەست بکرێتە سەر خەڵکی سڤیل، هەروەها هەموو جۆرە هێرشێکی رەمەکیش بۆ سەر خەڵکی سڤیل قەدەغە دەکات، هێرشی رەمەکیش بریتین لەو هێرشانەی کە دەکرێنە سەر ئەو شوێنەی ئەگەری بوونی هێزی چەکداری شەڕکەرو خەڵکی سڤیل پێکەوە هەیە، بۆیە ئەو یاسا نێو دەوڵەتیانە هەمیشە جیاوازی لە نێوان ئامانجی سەربازی و ئامانجی سڤیل دەکەن، هەموو ئامانجە سڤیلەکانیش ئەوانەن کە لە خزمەت ئامانجە سەربازیەکاندا نین وەک ماڵ، پەرستگا، قوتابخانە، نەخۆشخانە، مۆزەخانە هتد.
بۆ ئەوەی ئەو کارانە روونەدەن یاسا نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە جەنگ کۆمەڵێک رێسا بەسەر لایەنە شەڕکەرەکاندا دەسەپێنێت، جا ئەگەر شەڕەکە نێودەوڵەتی بێت یاخود نێوخۆیی بێت.
- دەبێت هەموو رێگایەکی پێویست بگیرێتەبەر بۆ ئەوەی بزانرێت کە ئامانجەکە سڤیل نییە.
- لە کاتی هەڵبژاردنی شێوازێکی تایبەت لە هێرش و پەلامار دەبێت تەگبیرو پلانێک هەبێت بۆ ئەوەی خەڵک و ئامانجە سڤیلەکان پێوە نەبن.
- پەلامارو هێرشێک ئەنجام نەدرێت کە گومانی ئەوەی لێدەکرێت خەڵک و ئامانجە سڤیلەکان پێوە دەبن.
- ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت بۆ ئەو شوێنانەی ئەگەری بوونی هاوڵاتیانی سڤیلی لێدەکرێت.
هەموو هێرشکردنێک بە پێچەوانەی ئەو خاڵانەی سەرەوە کە دەکرێتە سەر خەڵک و ئامانجی سڤیل بە پێشێلکاری تۆمار دەکرێت و تا ئاستی

تاوانی جەنگ بەرز دەبێتەوە.
کوشتن دژ بە مادەی شەشەمی پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنییەکانە لە برگەی یەکەمیدا، هەروەها دژ بە مادەی چوارەمی پەیماننامەی ئەفریقی مافەکانی مرۆڤە، هەروەها لە پرۆتۆکۆلی دووەمی زیادکراو بۆ رێکەوتنی رۆما ١٩٤٩ (مادەی ٤، برگەی ٢ / ئەلیف) قەدەغەی کوشتن دەکات لە جەنگی نێودەوڵەتی و نێوخۆشدا، هەموو مادەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەم تاوانە بەپێی بارودۆخی ئەنجامدراوی رووداوەکە حوکمی بەسەردا دەدرێت کە داخۆ تاوانی جەنگە یاخود تاوانی دژ بە مرۆڤایەتییە.
لە کێشەی دارفوردا خاڵێکی گرنگ لێرەدا راوەستان دەخوازێت، ئەویش ئەوەیە کە بەر لە توندوتیژییەکانیش هەموو کەسێک لە دارفور چەکی خۆی هەبووەو حکومەتی سودانیش لەو بارودۆخە ئاگادار بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو خاوەن چەکێک یاخود هەموو چەکدارێک لەو دەڤەرە وەک یاخیبوو نابێت هەژمار بکرێت، بۆیە تەنانەت ئەو خەڵکە سڤیلەی کە رووبەڕووی هێرش بوونەتەوە چەکداریش بووبن ئەمە پاساو بە حکومەتی سودان نادات کە ئەوانە بەرهەڵستکارو یاخی بووبن.

## کوشتنی خەڵکی مەدەنی ( سڤیل):

لیژنەکە لە سەردانەکانی خۆیدا بۆ هەرێمی دارفور، کوشتنی بە ئانقەست و بەبەرنامەی بۆ دەرکەوت، نەک تەنها کوشتی بە کۆمەڵی سڤیل بەڵکو بەدیل گرتن و دەستبەسەراگرتنی نایاسایی و لە سێدارەدانی

خێراو کوشتنی ڕەمەکی و لاقەکردنی ئافرەتانیش. لە هێرشی یەکەمدا بۆ سەر گوندەکانی ناوچەی شاتایا، وێڕای خاپورکردنی ٩ گوند، ٨٥ کەس بە کۆمەڵ کوژراون کە لەنێوانیاندا ٥ ئافرەت و ٣ منداڵ هەبوون، پاش هێرشەکە هەموو خەڵکی ئەو گوندانە پێکەوە بەرەو ناوچەی (کایلک) ڕۆیشتوون، بەڵام کەوتونەتە نێو بۆسەی جەنجەویدەکان و بەشی زۆریان کوژراون. لیژنەکە بۆی ئاشکرا بووە کە میلیشیاکانی جەنجەوید چەندین جارو لە چەندین پرۆسەی خۆیاندا بە ئانقەست منداڵیان کوشتووە، کوشتنەکانیش شێوازی زۆر دڕندانەی وەک سوتاندن و لەتوپەتکردنی گرتۆتەوە.

بەڵگەی تەواو لەبەردەم لیژنەکەدا هەبووە کە خەلکانی گوندنیشینی ژێر دەسەڵاتی حکومەت و دوور لە ناوچەکانی پێشەوەی کوشتار خراونەتە بەردەم ڕەحمەتی هێزەکانی جەنجەوید و لە نێو چادرگاو پەناگەکاندا بە ئانقەست خواردن و خواردنەوەیان لێگیراوەو ئافرەتەکانیشیان لاقە کراون و هەندێک جاریش منداڵ و کچ بۆ شوێنی نادیار براون و نەگەڕێنراونەتەوە.

لیژنەکە هەندێک لێدوانی لایەنە پەیوەندارەکانی حکومەتی سودانی تۆمار کردووە کە بەتەواوی بەڵگەی ئەوەن کە حکومەت تاوانبارە لە کوشتنی بە ئانقەستی مەدەنییەکان، وەزیری بەرەڤانی سودان لەم بارەوە دەڵێت ( بوونی تاقە یەک یاخی بووش بەسە بۆ ئەوەی گوندێک بکەین بە ئامانجێکی سەربازی، کاتێک حکومەت زانیاری سەبارەت بە گوندێک وەردەگرێت کە یاخی بووەکانی تێدایە، ئیتر ئەو گوندە دەکرێتە ئامانجێکی سەربازی و سیفەتی مەدەنی بوون لەدەست دەدات)، لەم بارەوە هیچ بەڵگەیەک لە ئارادا نییە کە هێزەکانی حکومەت بەر

له ئەنجامدانی هێرشەکانیان خەڵکانی سڤیلی گوندەکانیان ئاگادار کردبێتەوە که بەهۆی بوونی یاخیبووەکانەوە گوندەکانیان چۆڵ بکەن بۆ ئەوەی هەمان چارەنوسی یاخیبووەکان چاوەڕێیان نەکات. حکومەتی سودان لەم بارەوە لەو باوەڕەدایە کە خەڵکانی سڤیل بە پێشکەشکردنی هاوکاری بۆ یاخیبووەکان هەموو جۆرە سیفەتێکی یاسایی ( هاوڵاتی سڤیل) لەدەست دەدەن و وەک جەنگاوەرو یاخی بوو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، ئەمەش واتای ئەوەیە کە هەموو خەڵکانی سڤیل بە ژن و منداڵ و پەککەوتەو خەڵکانی بێلایەن و بێ چەکەوە دەبنە ئامانجی کۆمەڵکوژی حکومەتی سودان و هێزە هێرش بەرەکانی.

لیژنەکە ئەوەشی بۆ دەرکەوتووە کە یاخیبووەکانیش کەسانی سڤیلیان کوشتووە، بەڵام ئەم کوشتارانە کەم بوون، هەروەها لیژنەکە هەندێک راپۆرتیشی سەبارەت بە دەستدرێژیکردنە سەر کارمەندانی بواری خزمەتگوزارییە مرۆییەکان بەدەست گەیشتووە، هەرچەندە کوژرانی دوو کارمەندی نێودەوڵەتی بە مین هێشتا تەواو پشتڕاست نەکراوەتەوە بەڵام سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەو کارمەندانە کەوتونەتە نێو ناوچەی مینرێژکراوی هێزە نەیارەکانی حکومەتی سودانەوە.

هەموو ئەم کارانە بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکانی جەنگی نێوخۆ بە کاری دژ بە مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگ پێناس دەکرێت، مادەی ژمارە ٣ لە رێکەوتنی جنێف ١٩٤٩هەروەها مادەی ٤ برگەی ئەلف لە پرۆتۆکۆلی دووەم جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە نابێت خەڵکی سڤیلی بەشدار نەبوو لە شەڕەکاندا بکوژرێن، هەروەها بەپێی (پەیمانی رۆما ١٩٩٨،

مادەی هەشتەم برگەی دووەم /هـ/١) هەموو پایەکانی تاوانی جەنگ بەسەر ئەم کەیسەدا دەچەسپێن.

## کوشتنی دەستبەسەرەکان و بریندارەکان و دیلەکانی شەڕ :

لیژنە تایبەتەکە هەندێک بەڵگەی کەمی چنگ کەوتووە سەبارەت بە کوشتنی دیلەکان یاخود مردنیان لە زینداندا، زۆربەی ئەم دیلانە بە تاوانی بەشداریکردنی شەڕ و خۆحەشاردان لە نێو هاوڵاتیاندا دەستگیر کراون. نەبوونی یاخود لاوازی بەڵگەی کوشتنی دیلەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە بنەڕەتدا هێزە شەڕکەرەکان دەستیان لە کوشتن نەپاراستووە و کەمترین ژمارەی شەڕکەری زیندوویان هێشتۆتەوە، مادەی سێیەم لە بەشی یەکەمی خۆیدا برگەی ئەلف بەهەموو جۆرێک کوشتنی دیلەکانی جەنگ یاخود زیندانییەکان قەدەغە دەکات و وەک تاوانی جەنگ ناوی بردووە، ئەو کەسانەی کە دەستگیرکراون ئەگەر سەر بە گروپەکانی یاخیبووەکانیش بووبێت، کوشتنیان لە زینداندا هیچ پاساوێکی نییە و دژ بەیاسای نێودەوڵەتییە و تاوانباران بە ئەنجامدانی تاوانی جەنگ تۆمەتبار دەکرێن. یاسای مرۆیی نێو دەوڵەتی لە مادەی ٣ برگەی ١/ ئەلیف رێگا لە خراپ مامەڵەکردنی ئەو کەسانە دەگرێت و لە مادەی ٣ برگەی ١/ئەلیف هەموو جۆرە کوشتن و لە سێدارەدانێک بەبێ ئەوەی کە پێشتر ئەو کەسە دادگایی کرابێت و لە ڕێگای دادگاوە حوکمی درابێت بە کوشتنی ئانقەست و تاوانی جەنگ هەژمار دەکات، بەپێی هەمان مادە و هەمان برگە کوشتنی بریندارەکانی جەنگ وەک تاوانی جەنگ هەژمار دەکرێت.

## روخاندن و خاپورکردنی گوندەکان:

لیژنەکە لە راپۆرتەکانی خۆیدا ئاماژە بۆ تێکدان و روخاندن و خاپورکردن و سوتاندنی گوندەکان دەکات لە سەر دەستی هێزەکانی جەنجەوید، هێزەکانی حکومەتی سودانیش لە کاتی ئەم پرۆسانەدا کاری پاراستنی ناوچەکە و تەوقکردن و ئابلۆقەدان و پاشان پارێزگاریکردن لە هیزەکانی جەنجەوید و دابینکردنی پاڵپشتی بۆیان ئەنجام داوە.

لەم کردەوانەدا سوتاندنی ماڵان و تێکدانی باخ و کێڵگەکان و روخاندن و سوتاندنی قوتابخانەو بنکەی تەندروستی و ئاشی هارینی گەنم و کوێرکردنەوەی بیرەکان و شکاندنی ئامێری ئاو هەڵکێشان ئەنجام دراون.

لیژنەکە گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە جۆری روخاندن و خاپورکردنەکە بە شێوەیەکی نەخشەکێشراو بووەو ئامانجی ئەوە بووە کە خەڵکی سڤیلی ئەو ناوچانە بە یەکجاری لە شوێنەکانی خۆیان هەڵکەنرێن و هەرگیز نەتوانن بگەرێنەوە بۆ زێدی خۆیان.

بەپێی هەندێک زانیاری پتر لە ٧٠٠ گوندی هەرێمی دارفور بەشێوەیەکی تەواو یان نیمچە تەواو خاپورکراون، سەرچاوەکانی پۆلیسی سودان ژمارەی گوندە خاپورکراوەکان بە ٢٠٠٠ گوند مەزەندە دەکات.

ئەم هەنگاوانەش وێرای نەبوونی هیچ پاساوێکی جەنگی دەچنە نێو چوارچێوەی دەرکردنی زۆرەملەی دانیشتوان بە تایبەت ئەگەر زانیمان هەندێک لەو گوندانە لە پاشاندا دراون بە هۆزە عەرەبەکانی جەنجەوید، هەر لەئاکامی ئەم کردەوانەدا سەدان هەزارکەس لەبەر هەرەشەکانی جەنجەوید ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێهێشتووە.

روخاندن و خاپورکردنی گوندەکان دەچێتە چوارچێوەی تاوانی جەنگەوە،

دادگای لاهای له دۆسیەی یوگوسلاڤیادا له رۆژی ٢٦-١-٢٠٠١ بە روون و ئاشکرایی ئەم برگەیەی پشستڕاست کردۆتەوە. مادەی ١١ له پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و فەرهەنگییەکانی مرۆڤ رێگا لەهەر جۆرە خاپورکردن و وێرانکردنێکی بە ئانقەست دەگرێت، له کەیسی دارفوردا حکومەتی سودان له ژێر پاساوی بوونی یاخیبووەکاندا بە شێوەیەکی مەنهەجی بەرنامەی تێکدان و خاپورکردن و وێرانکردنی گوندەکانی پەیڕەو کردووە، ئەمەش بە هەموو پێودانگە یاساییەکان بە تاوانی جەنگ هەژمار دەکرێت.

## بەزۆر گواستنەوەی خەڵکی سڤیل و ئاوارەکردنیان:

یەکیک له ئامانجە سەرەکییەکانی هێزەکانی حکومەت و میلیشیاکانی جەنجەوید ئەوە بووە کە دەست بەسەر خاک و زێدو سامانی خەڵکی دارفوردا بگرن، بۆیە نەخشەی هێرشەکانیان بە جۆرێک داڕشتووە کە خەڵکی ئەو دەڤەرانە بۆ هەمیشە لەو شوێنانە هەڵکەنن و پاشان خۆیان دەست بەسەر ماڵ و گوند و خاکەکەیاندا بگرن، دەرکردن و گواستنەوەی بەزۆرو ئاوارەکردن و کۆچی زۆرە ملە یەکێک بوون له ئامرازەکان، ١.٨٥ ملیۆن کەس لەم شاڵاوانەدا دەربەدەر بوون کە بەشی هەرە زۆریان هەر له ناوخۆی سودان ماونەتەوە و ٢٠٠ هەزاریشیان بەرەو دەوڵەتی چاد هەڵهاتوون.

بەپێی ئەو زانیارییانەی دەست نێرژەی نەتەوەی یەکگرتووەکان کەوتووە، دەرکردن و کۆچپێکردن له ماوەیەکی دیاری کراوی ئەو ململانێیەدا زۆر بە خێرایی پەرەی سەندووە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە

که هێرشکاران لەم کارەی خۆیاندا ئامانجی دیاریکراویان هەبووە، چونکە لە زۆر حاڵەتی گەڕانەوەی ئاوارەکاندا بۆ گوندەکانی خۆیان دیسانەوە کەوتوونەتەوە بەر هێرش.

بەپێی مادەی حەوتەم برگەی ٢/دال لە رێکەوتنی رۆما گواستنەوەی بەزۆرو دەرکردنی خەڵکی سڤیل و بەزۆر دوورخستنەوەیان بەبێ بوونی پاساوی یاسایی کە بەڵگەی تەواوی یاسایی هەبێت دەچێتە چوارچێوەی تاوانی دژ بە مرۆیی، چونکە حکومەتی سودان بەپێی بەرنامەو کاری پێشوەخت ئەم سیاسەتەی پیادەکردووە، سروشتی مەنهەجی بوونی دەرکردن و راگواستن لە دارفور و چۆنییێتی جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوانە لەلایەن هێرشبەرەکانەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم هەنگاوانە رووداوی جەنگ نەبوون بەڵکو سیاسەتی حکومەت بوون.

## ئەشکەنجە ولاقەکردن و دەستدرێژی سێکسی:

راپۆرتی لیژنەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە چەندین جۆری جیاواز لاقەکردن ئەنجام دراون:

ئەلف- لاقەکردنی بەزۆری کچان و ژنان، لاقەکردنەکان بە تاکەکەسی و بە کۆمەڵ ئەنجام دراون.

بێ- رفاندنی کچان و ژنان و دەستبەسەرکردنیان و لاقەکردنی بەردەوام و دووبارەیان.

جیم- بەردەوامیدان بە کردەوەکانی لاقەکردن و دەستدرێژی سێکسی

بۆ سەر کچان و ژنانی نێو چادرگاکان بەتایبەت ئەو کاتانەی بۆ کۆکردنەوەی دارو پوش و پەلاش ناچار دەبوون دوور کەونەوە.
هەروەها ئەشکەنجەی زۆر نامرۆڤانەش لە وێنەی روتکردنەوەی بەزۆری ئافرەتان و سوکایەتی پێکردنی دەستگیرکراوان و فڕەدانی منداڵ و ژن و پیاوانی دەستگیرکراو بۆ ناو ئاگر.
ئەشکەنجەی دەرونی بەرامبەر بە دەستگیرکراوەکان بەکارهاتووە، چەندین حاڵەتی ئەوتۆ تۆمارکراوە کە بەبەرچاوی دایک و باوکەوە منداڵ فڕەدراوەتە نێو ئاگر هەتا ئەو کاتەی بە تەواوی سوتاوەو مردووە، چەندین کەس لە دەستگیرکراوەکان ئەشکەنجە دراون و ئەندامی لەشیان لەدەستداوە یاخود کەمئەندام بوون، هەندێک لە دەستگیرکراوان بە دەستبەستراوی بەدوای ئەسپ و حوشترەوە راکێشکراون. دەستگیرکراوان بە جنێو و یاخود ناولێنان و ناتۆرکەی رەگەزپەرستی کەرامەتیان شکێنراوەو بە کۆیلەو رەش پێست بانگیان کراوە.
بەڵگەی تەواویش لە بەردەستدا هەیە کە هێزە یاخیبووەکان ئەم کارانەیان بەشێوەیەکی کەم و لە ماوەیەکی دیارکراودا ئەنجام دابێت، بەڵگەی تەواو لەکن لیژنەکە هەیە کە میلیشیاکانی جەنجەوید و سەربازەکانی سوپای سودان ئەم کارانەیان بەردەوام ئەنجام دابێت، بۆ نمونە لە ژانیوەی ساڵی ٢٠٠٤ دا ئەو هێزانە لە خۆرئاوای دارفور ٢١ ژنیان رفاندووەو بۆ ماوەی ٣ مانگی رەبەق لای خۆیان لاقەیان کردوون و بەو هۆیەشەوە چەندینیان دووگیان بوون، لە نێوان مانگی ئۆگستۆس و سێپتێمبەری هەمان ساڵدا لە باشوری دارفور ١٢٠ حاڵەتی لاقەکردن تۆمار کراون، لە باکوری دارفوریش لە ناوچەی (کۆرما) ٢٠ ئافرەت و

منداڵی خوار تەمەن هەژدە ساڵان لاقەکراون.
هەروەها یەکێکی دیکە لە کردەوەکانی لاقەکردن بە رفاندنی ئافرەتەکان و بردنیان بۆ نێو سەربازگاکان بووە، لە مانگی مارسی ٢٠٠٤ دا لە باکوری دارفور ١٦ ئافرەت لەنێو گوندەکاندا جیاکراونەتەوەو براون بۆ سەربازگاکان و بەدرێژایی چەندین رۆژ لاقەکراون، هەروەها چەندین جاریش هێزەکانی جەنجەوید هەڵیانکوتاوەتە سەر قوتابخانەی کچان و لە هەمان شوێن لاقەیان کردوون و پاشان چەندین دانەشیان جیاکردۆتەوەو لەگەڵ خۆیاندا بۆ هەمان مەبەست بردویانن، ئەو قوتابیە کچانە لە وتەکانی خۆیاندا باسی ئەوەیان کردوە کە لەهەمان سەربازگادا بەردەوام ئافرەتی دیکەیان لە گوندەکانی دەوروبەرەوە رفاندووەو بە هەمان مەبەست هێنراونەتە ئەو شوێنە و دەستبەسەریان کردوون.
ژمارەی رووداوەکانی لاقەکردن یەکجار زۆرن بەڵام لەبەر هەستیاری بابەتەکەو بەستنەوەی بە مەسەلەی شەرەف و ئەخلاقەوە، زۆر لەو حاڵەتانە پەردەپۆش کراون و بە نهێنی ماونەتەوە.
مامەڵەی توند و نامرۆڤانەو ئەشکەنجەی سێکسی لە چەندین پەیماننامەی نێو دەوڵەتیدا کە بەشێکی زۆریان لە لایەن سودانەوە مۆرکراوە، قەدەغەکراوە، لەوانەش پەیمانی تایبەتی نێودەوڵەتی مافە سیاسی و مەدەنییەکان لە مادەی (٧) دا، پەیمانی مافەکانی منداڵ لە مادەی (٣٧)دا، پەیمانی ئەفریقی بۆ مافی مرۆڤ لە مادەی (٥)دا.
مادەی (٣) لە رێکەوننامەی جنێف ئاماژە بۆ سەلامەتی مرۆڤ و جەستەی دەکات، لەو مادەیەداو لە برگەی ١/ئەلیف، دەستدرێژیکردنە سەر کەرامەتی مرۆڤ قەدەغەدەکات، لە (مادەی

٤/ بڕگەی ٢/ هـ )هەموو جۆرە دەستدرێژیکردنێکی سێکسی قەدەغەدەکات و لە هەمان بڕگەدا لە بەشی (و) هەموو جۆرە کویلەکردنێکی مرۆڤ و چەوساندنەوەی قەدەغەدەکات، هەموو ئەم بڕگانە هەرجۆرە کارێکی لەو جۆرە بە تاوانی جەنگ و تاوانی مرۆیی پۆلێن دەکات.

## تالآن و دزی و راوڕووت:

هەموو راپۆرتەکان ئاماژە بۆ ئەنجامدانی کاری دزین و تالآنکردن دەکەن، میلیشیاکانی جەنجەوید بە پاڵپشتی هیزەکانی حکومەت لە تەواوی هێرشەکانیاندا دزین و تالآنکردنی مالآن، دوکان و بازاڕ، دەستبەسەراگرتنی مەڕو مالآت و حوشترو رەشەوڵاخ و باڵندەی ماڵی، هەروەها دزینی کەلوپەلی وەک جلوبەرگ و پێڵاویان ئەنجامداوە.

نمونەی کارەکانی تالآن و بڕینی مالآن زۆرن، لەرۆژی شەممەی ٢٧-١٢-٢٠٠٣ لە گوندی (دۆما)ی باشوری دارفور دەمەو بەیان لە کاتژمێر٠٣:٥ دا هێرشبەرەکانی جەنجەوید لە سەرپشتی ئەسپ و حوشترگەمارۆی ئەو گوندە دەدەن و سەرباری ئەوەی ١٧ کەس دەکوژن، ١١٥٠ سەر رەشەوڵاخ و ٨٠٠ سەریش مەڕومالآت بەتالآن دەبەن.

راپۆرتەکان ئاماژەیەکی کەمیان سەبارەت بە ئەنجامدانی ئەو کارانە لە لایەن یاخیبووەکانەوە تێدایە.

هەموو ئەو تاوانانەی کە تایبەتن بە تالآنکردن و دزین و دەستبەسەراگرتنی ماڵ و موڵکی هاوڵاتیان بە تاوانی جەنگ پۆلێن کراون، حکومەتی

سودان لەبەردەم هەموو ئەم تاوانانەدا بێدەنگ و بێ هەڵوێست بووە، بگرە لەوەش زیاتر دەکرێت ئاماژە بە بوونی ئاسانکاری هەبێت لە لایەن حکومەتەوە بۆ هێزەکانی جەنجەوید تا کاری دزیکردن و تاڵاکردن بە ئارەزووی خۆیان ئەنجام بدەن، لێنەپرسینەوەی حکومەت لەو کارانە بۆتە هۆکاری ئەوەی کە جەنجەویدەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەم کارانەیان ئەنجام دابێت.هێزە یاخیبووەکان زیاتر کاری تاڵانکردنی بنکەو بارەگاکانی حکومەتیان ئەنجامداوە، دەستیان بەسەر چەک و تەقەمەنی و کەلوپەلی سەربازیدا گرتووەو ئەمەش وەک دەستکەوتی شەڕ بۆ خۆیان بە کارێکی رەوایان زانیوە.

## چەکدارکردن و سەربازگیری لە نێو منداڵان:

شەڕی نێوان خەڵکی دارفورو حکومەتی سودان خەڵکی ئەو دەڤەرەی ناچارکرد بۆ بەرگریکردن لە خۆیان بەرامبەر بەو هەموو دەستدرێژیانە گەورەو بچوکیان چەک هەڵبگرن، زانیارییەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هێزی یاخیبووەکان منداڵانی خوار پازدە ساڵ چەکدار دەکەن و لە بەرەکانی شەڕدا بەشداریان دەکەن، وێڕای ئەوەی کە هێزەکانی بەرهەڵستیکاری دارفور لە پێگەی بەرگریکردن لە خۆدا بوون و ناچار بوون بەهەموو شێوازێک بەرگری لە خۆیان بکەن بەڵام هەر ئەم خاڵە لە راپۆرتەکەدا وەک خاڵێکی نەگەتف ئاماژەی بۆکراوە، هەر هەمان راپۆرت لە درێژەی ئەم خاڵەدا دەڵێت ( ئاماژەی ئەوە لە گۆڕێدا نییە کە ئەم کردەوەیە بە زۆر ئەنجام درابێت، لەنێو بنکەو بارەگای ئەو هێزانەدا ئەو منداڵانە بەدی کراون، هەروەها حکومەتی سودانیش

له راپۆرتەکانی خۆیدا ئەو هێزانەی بەو بەڵگەیە تۆمەتبار کردووە)، له سازدانی چەندین چاوپێکەوتن لەگەڵ هێزە بەرهەڵستیکارەکانی دارفوردا لەم بارەوە، ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە ئەو منداڵانەی خوار تەمەن هەژدەساڵن بەهیچ شێوەیەک لە کردەوە سەربازیەکاندا بەکار ناهێنرێن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو گروپانە باسی ئەوە دەکەن کە بەهۆی تەشەنەسەندنی کوشتن و هێرشەکانی حکومەت و جەنجەویدەوە ئەوان ناچارن بۆ ئەوەی منداڵەکان لە دەستدرێژی بپارێزن لەگەڵ خۆیاندا لە نێو سەربازگاکان بۆ پاراستنیان بیانهێڵنەوە و بەهیچ جۆرێک کاری سەربازی بەو منداڵانە ناکەن تەنها هەندێک کاری خزمەتگوزاری سەربازی نەبێت کە ئارەزوو مەندانە ئەنجامی دەدەن.

## هەڵسەنگاندن و بڕیاری لیژنەکە:

لیژنەکەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاپۆرتەکەی خۆی پێشکەش بە ڕێکخراوەکە کرد و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە ڕێگای ئەو ڕێکخراوەوە لە ڕاستیەکان ئاگادار کرایەوە، هەر لە ڕێگای ئەو لیژنەیەوە جۆری تاوانەکان و تاوانبارەکان و میکانیزمی دادگایی کردنیان خرایە بەردەم ڕای گشتی جیهان، لیژنەکە سەبارەت بە تاوانباران بەمجۆرەی خوارەوە ڕیزبەندی کردوون:

## ئەنجامدانی تاوانی نێو دەوڵەتی:

هەرکەسێک بە تەنها خۆی یاخود بە هاوبەشی لەگەڵ کۆمەڵێک کەسی دیکەدا، هەر تاوانێک کە لە بڕگەکانی یاسای نێودەوڵەتیدا هاتوون (وەک لە پێشەوە باسکران)،ئەنجام بدات، ئەوە بە تەنها خۆی وەک کەسایەتی بەرپرسیار دەبێت بەرامبەر بە تاوانەکانی و دەبێت بخرێتە بەردەم یاسا، لەم بارەوە لیژنەکە بەمجۆرە بڕیاری خۆی داوە:

یەکەم: حکومەت:

لیژنەکە شوناسی ٦ بەرپرسی حکومەتی سودانی دیاریکرد کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشدار بوون لە ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی، ٥ لەو تاوانبارانە پلەداری هێزە چەکدارەکانی حکومەت یاخود پلەداری مەدەنین لە حکومەتە ناوخۆییەکانی دارفوردا، ئەمانە راستەوخۆ سەرکردایەتی یاخود بەشدارییان کردووە لە تاوانەکاندا.

دووەم: جەنجەوید:

لیژنەکە ١٤ کەسی لە هێزەکانی جەنجەوید دەستنیشان کردووە کە تاوانبارن بە ئەنجامدانی تاوانی نێو دەوڵەتی، زۆرێک لەم کەسانە بە چەندین تاوانی جیاواز و جۆراوجۆر تۆمەتبار کراون.

سێیەم: لە نێو هێزە یاخیبووەکاندا ٣ کەس دەستنیشان کراوە کە تۆمەتبارن بە هەمان ئەو تاوانانە.

چوارەم: هەروەها شوناسی ٣ ئەفسەری بێگانە دەستنیشان کراوە کە دەستیان لە تاوانەکاندا هەبووە.

## ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی بە هاوبەشی:

ئەم بەشە لە تاوان ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە پشتەوە ناراستەوخۆ بەشدار بوون لە تاوانەکە ئەویش بە نەخشەبۆکێشان، فەرمانکردن بە جێبەجێکردن،هاندان بۆ جێبەجێکردن، هاوکاری بۆ جێبەجێکردن، پاڵنان بۆ جێبەجێکردن، لەم بارەشەوە لیژنەکە بەمجۆرە خوارەوە بریاری خۆی داوە:

یەکەم: حکومەت: لیژنەکە ناسنامەی ٦ کەس وەک تاوانبار لە نێو حکومەتدا دیاری دەکات، کە تۆمەتباران بە ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی بە هاوبەشی، ئەم کەسانە هەندێک ئەفسەری سەربازی و پلەداری حکومەتن لە دەسەلآتی ناوەند.

هەروەها لیژنەکە ٨ کەسی دیکەی لە بەرپرسانی ناوخۆیی هەرێمەکەو هێزە چەکدارەکانی دەڤەرەکە دیاری کردووە، سێ کەس لەوانە بەرپرسن لە دەستگیرکردن و ونکردنی خەڵک لە ناوچەکە و پێنج کەسی دیکەش لە کردەوە هاوبەشەکانی کوشتن و سوتاندن و کاولکردن و تاڵان کردندا بەشدار بوون.

دووەم: جەنجەوید:

١٤ کەس لە هێزەکانی جەنجەوید بە هەمان تاوان تۆمەتبار کراون.

سێیەم: یاخیبووەکان: لە نێو یاخیبووەکانیشدا ٣ کەس تۆمەتبارکراون کە بەشدار بوون لە تاوانی هاوبەشدا لە هێرشکردنە سەر گوندەکان و کوشتن و رفاندن و وێرانکردندا بەشدار بوون.

چوارەم: شوناسی ٣ ئەفسەری بێگانە بە هەمان ئەو تۆمەتانە دیاری کراوە.

یارمەتیدان بۆ ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی و هاندان بۆ ئەو تاوانە:

ئەم بڕگەیە بریتییەلە هەر جۆرە هاوکاریکردن یاخود پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ هاندان و ئەنجامدانی تاوان، بۆ نمونە پێدانی چەک و تەقەمەنی، هاندان لە ڕێگای ڕاگەیاندن و پێشکەشکردنی هاوکاری مەعنەوی، لەم بارەشەوە لیژنەکە ئەم تاوانبارانەی تۆمەتبار کردووە:

یەکەم: حکومەت:

لیژنەکە ناسنامەی ٦ کەسی لە دەسەڵاتدارانی ناوەند دیاری کردووە کە لەڕێگای پێدانی چەک و تەقەمەنی و کۆکردنەوەی ئەندامان و سەربازگیری و هاندانەوە تۆمەتبارکراون، بەهەمان شێوەش ٧ کەس لە دەسەڵاتدارانی هەرێمەکە دیاری کراون.

دووەم: جەنجەوید:

لە ئەندامانی جەنجەوید ٤ کەس تۆمەتبارکراون بە ڕێکخستنی هێزەکانی جەنجەوید و پڕچەک کردن و هاندان و پێشکەشکردنی یارمەتی دارایی بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانانە.

## نەخشەکێشان بۆ ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی:

نەخشەکیشان بۆ ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی بریتییەلە هەموو جۆرە تەگبیرکردن و ڕاوێژکردن و ڕێکەوتنێک لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا بۆ ئەنجامدانی تاوانێکی نێودەوڵەتی، ئەمەش بەوە دەبێت کە کەسێک یاخود کۆمەڵە کەسێک پێکەوە بیر لە چۆنییەتی داڕشتنی پلانێک بکەنەوە و ئامادەسازی بۆ ئەنجامدانی تاوانێکی نێودەوڵەتی بکەن، لیژنەکە لە پێداچوون و لێکدانەوەکانی خۆیدا، پشتئەستور بەو

بەڵگانەی لەژێر دەستیدا بوون، گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە هێرشی هێزەکانی حکومەت و جەنجەوید پێکەوە چوارچێوەیەکی مەنهەجی بەردەوامی هەبووە و دەرئەنجامی ئەو سیاسەتە بووە کە پێشتر نەخشەی بۆ داڕێژراوەو لە ئاستێکی باڵاشەوە چاودێری جێبەجێکردنی کراوە. لەم بوارەشدا دوو کەس لە بەرپرسانی هەرێمی دارفور لە تاوانەکەوە تێوەگلاون.

## فەرمانکردن بە ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی:

ئەو کەیسە جۆراو جۆرانەی لە دادگای نێودەوڵەتیدا چارەسەرکراون، ئەوەی سەلماندووە کە بۆ ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی مەرج نییە بە نوسین و بە نامەی فەرمی یاخود بە بەڵگە ئەو فەرمانە دەربچێت، بەڵکو هەروەک لە دادگای یوگوسلاڤیای کۆن بەدیار کەوتن، بەڵکو لە ڕێگای ئاماژە و بەڵگە و پێدراوەکانەوە دەتوانین بگەینە بەڵگەی ئەوەی کە تاوانەکە بە بڕیار و فەرمان بووە، بەڵام دەرکردنی فەرمان بۆ ئەو کارە پێویستی بە پەیوەندی نێوان سەرۆک و ئەندامانی خوارەوە هەیە واتە پەیوەندی نێوان ( ئەو کەسەی فەرمان دەکات و ئەو کەسەی جێبەجێی دەکات)، ئەمەش کارێکی زۆر زەحمەت نییە. لەم بارەوە لیژنەکە بەمجۆرە دەرئەنجامەکانی خۆی باس دەکات:

یەکەم: حکومەت:

لیژنەکە دوو کەسی لە حکومەت و دوو کەسیشی لە هێزە چەکدارەکانی ناوچەی دارفور بە فەرمانکردن بۆ ئەنجامدانی تاوانی نێودەوڵەتی تۆمەتبار کرد، هەروەها بە هەمان بەڵگەو تاوانیش دووکەسی لە جەنجەوید تۆمەتبارکرد.

## ڕێگە نەگرتن و چاوپۆشی لە تاوانی نێودەوڵەتی:

یاسای نێو دەوڵەتی هەموو ئەو کەسانەی کە پۆستی باڵایان هەیە و بەشێوەیەک لە شێوەکان تێوەگلاون لە تاوانەکاندا، دەخاتە بەردەمی یاساو لێپێچینەوە.چاوپۆشیکردن و کەمتەرخەمی و ڕێگەنەگرتن لە ڕوودانی تاوانی نێودەوڵەتی ئەو تۆمەتانەن کە ئاراستەی بەرپرسانی باڵا دەکرێت، بۆ ئەوەی تۆمەتەکانیش زەمینەی یاساییان هەبێت دەبێت ئەم مەرجانە لە گۆڕیدا بن:

یەکەم: ئەو کەسە کە لە پۆستە باڵاکەدایە دەبێت سەرکردەی فعلی بێت و هەموو دەسەڵات و کۆنترۆڵێکی بەسەر تاوانبارانی خوارەوە هەبێت.

دووەم: دەبێت ئەو سەرۆکە زانیاری تەواوی هەبێت لەسەر ڕووداوەکان، یاخود ئاماژەی ئەوە هەبێت کە ئاگادار بووە، یاخود لانی کەم هێندە زانیاری لە کن بووە کە وەک سەرۆکێک دەرئەنجامی ئەوەی هەڵهێنجابێت کە ئەو تاوانانە دەچنە چوارچێوەی تاوانی نێو دەوڵەتیەوە.

سێیەم: سەرۆک خەم سارد بووبێت یاخود کەمتەرخەم بووبێت یان چاوپۆشی کردبێت و ڕێگەی نەگرتبێت لە تاوانەکان.

سەبارەت بە هەڵوێستی یاخیبووەکانیش ئەوە پاساو هێنانەوە بەوەی کە ئەو هێزانە ئۆپۆزیسیۆن و میلیشیایین و وەک هێزێکی سەربازی ڕێکخراو مامەڵە ناکەن و لە مەیدانەکانی شەڕدا خۆیان بڕیار دەدەن،

پاساوێکی بەهێز نییە، چونکە سەرەنجام ئەو ڕێکخراوانە بە گوێرەی فەرمانی سەرکردەکانی سەرەوە ڕەفتار دەکەن، هەروەها ئەگەر سەرکردەی ئەو ڕێکخراوانە لە کاتی ڕودانی تاوانەکاندا هیچ هەنگاوێکیان بۆ ڕێگرتن و قەدەغەکردنی هەڵنەگرت ئەوە بەرپرسیارییێتی هەموو جەنگاوەرەکانی خۆیان دەکەوێتە ئەستۆ لە تاوانەکاندا. لیژنەکە لە هەر دوو حاڵەتەکەدا بەمجۆرە ڕەوشەکەی باس کردووە:

حکومەت:

سەبارەت بە حکومەت لیژنەکە ٨ تۆمەتباری دەستنیشانکردووە، کە هەموویان بەرپرسی باڵای حکومەت و دامەزراوەی سەربازین، هەروەها ٦ کەسی لە بەرپرسانی حکومەتی دارفور تۆمەتبار کردووە.

## هێزە یاخیبووەکان:

لیژنەکە بەڵگەی تەواوی کۆکردۆتەوە لەسەر تۆمەتبار بوونی ٤ کەسی هێزە یاخیبووەکان، کە بەرامبەر ئەنجامدانی تاوانە نێودەوڵەتییەکان کەمتەرخەم یاخود غەمسارد بوون و چاوپۆشیان کردووە.

# خاڵی وەرچەرخان لە کێشەی دارفوردا

بەردەوامی کوشتار لە ناوچەی دارفور بووە وێنەی لاپەڕەی یەکەمی زۆربەی ڕۆژنامەکان و بوو بە هەواڵی یەکەمی زۆربەی میدیاکانی جیهان، بەردەوامی ئەم وێنانە دەنگدانەوەیەکی یەکجار گەورەی لە دنیادا دروستکرد، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ناچارکرد کە بێنە وەڵام و سنورێک بۆ ئەو کارەساتانە دابنێن. حکومەتی سودان بە ناچاری لەگەڵ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێکهات لەسەر ئەوەی هێزی کڵاو شینەکان لە ناوچەی دارفوردا بۆ ناوبژێکردن بە هاوکاری هێزەکانی یەکێتیی ئەفریقا لەناوچەکەدا ئامادەییان هەبێت .

لە ڕۆژی ١٨ی ژونی ٢٠٠٤ دا (Jan Pronk)ی هۆڵەندی لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان کرا بە سەرپەرشتیاری کەیسی دارفور، هاوڕێ لەگەڵ کوفی ئەناندا سەردانێکیان بۆ ناوچەکە ڕێکخست.

لە ١٥ی مانگی ئۆگستۆسی ٢٠٠٤ دا بە بڕیاری یەکێتیی ئەفەریقا ١٥٠ سەبازی ڕواندی و پاشان ١٥٠ سەربازی دیکەی نەیجیری هاتنە دەڤەرەکەوە و پاشان بە تێپەڕبوونی کات هەتا ساڵی ٢٠٠٨ ژمارەیان بوو بە ٩ هەزار سەرباز، هاوکات لەگەڵ ئەمانیشدا لە ڕۆژی ٣١ی دیسێمبەری ٢٠٠٧ دا هێزەکانی یونامید (United Nations African Mission In Darfur) کە بە هێزی کڵاوشین ناسراون لە ناوچەکەدا جێگیر کران و هەردوو هێزەکە پێکەوە لە کۆتایی ٢٠٠٨ دا ژمارەیان بوو بە ٢٦ هەزار کەس.

لە ئاکامی هێرشە بەردەوام و سیستەماتیکییەکانی هێزەکانی سودان

و دژە هێرشی نەیارەکاندا هەتا سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ نزیکەی دوو ملیۆن کەس ئاوارە بوون، نزیکەی ٧٠٠ گوند بە شێوەیەکی تەواو یان نیمچە تەواو خاپور کران، ژمارەی ئەو کەسانەی لە دارفور بەهۆی ئەم کارانەوە دووچاری زەرەرو زیان بوونەتەوە بە پتر لە ٣.٥ ملیۆن کەس خەملێنراوە.

لە ٣١ی مارتی ٢٠٠٥ دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ژمارە ١٥٩٣ ی دەرکرد، لەو بڕیارەدا بەهۆی پێشێلکارییە مەترسیدارەکانی مافی مرۆڤەوە لە دارفور بڕیار درا کەیسی دارفور ڕەوانەی دادگای نێودەوڵەتی لاهای بکرێت، سەرەنجام لە ٢ی مارتی ٢٠٠٧ دا دادگای لاهای بە سەرۆکایەتی دادوەری بەناوبانگ ( لویس ئۆکامبۆ) بەتاوانی جەنگ و دژ بە مرۆڤایەتی سەرۆکی میلیشیاکانی جەنجەوید ( عەلی کوشایب) و وەزیری دەوڵەتی سودان ( ئەحمەد هارون)ی تاوانبارکرد.

بەڵام حکومەتی سودان تۆمەتەکان و رادەستکردنی ئەو دوو تاوانبارەشی ڕەتکردەوە، هەروەها نوێنەری سودان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان ( عەبدول مەحمود عەبدول حەلیم) ئەوەی ڕەتکردەوە کە ٣٠٠ هەزار کەس کوژرابن و ژمارەکەی بە درۆیەکی گەورە ناوبردو رایگەیاند کە حکومەتەکەی ژمارەی کوژراوەکان تەنها بە ١٠ هەزار کەس مەزەندە دەکات. لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٨ دا دادگای تاوانی نێودەوڵەتی لاهای دەستی کرد بە توێژینەوە لە تێوەگلانی ڕاستەوخۆی سەرۆکی سودان عومەر البشیر، لە ڕۆژی ٤ی مارتی ٢٠٠٩ دا یەکەم بڕیاری دەستگیرکردنیشی بۆ دەرکرد. دادگاکە حەوت تۆمەتی ئاراستەی سەرۆکی سودان کردووە، لەوانەش ئەنجامدانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی و کۆچی زۆرەملێ و ئەشکەنجەدان، هەروەها

دوو تۆمەتی ئەنجامدانی تاوانی جەنگیشی ئاراستە کرا لەوانەش سەرکردایەتی هێرشەکان بۆ سەر خەڵکی سڤیل و کوشتنی بە کۆمەڵ، بەڵام لەبەر نەبوونی بەڵگەی تەواو تۆمەتی پاکتاوکردنی نەژادی نەخرایە پاڵی. ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و یەکێتیی ئەفەریقاو حکومەتی ئەمەریکیش هێشتا ئەم کەیسەیان وەک جینوساید ریزبەند نەکردووە، هەرچەندە لە هەندێک ناوەندی ناڕەسمیدا ئەم کەیسە وەک جینۆساید باسی دەکرێت .

لە مانگی مارسی ٢٠٠٩ دا سەرۆکی سودانی عومەر ئەلبەشیر زۆربەی هەرە زۆری ڕێکخراوە ناحکومییەکانی بێگانەی لە سودان دەرکرد، هۆکاری ئەمەش بە لێکدانەوەی خودی حکومەتی سودان ئەوە بوو کە ئەو ڕێکخراوانە زانیاری چەواشەکاری و هەڵە بە دادگای نێودەوڵەتی لاهای دەدەن. لەنێو ئەو ڕێکخراوانەدا کە قەدەغەکران هەردوو ڕێکخراوی ئۆکسفام (Oxfam) و منداڵ پارێزی (Save children) بەریتانی بوون کە نەک تەنها لە دارفور بەڵکو لە تەواوی سودان کاریان دەکرد، ئۆکسفام ئەو ڕێکخراوەی کە ئاپرڵی ساڵی ١٩٩٤ کۆمەڵکوژیەکانی ڕواندای ئاشکرا کرد، خزمەتگوزارییەکانی ئاو و ئاوەڕۆ و تەندروستی بۆ ٤٠٠ هەزارکەس لە دارفور دابین دەکرد و منداڵ پارێزیش هاوکاری پێشکەش بە ٥٠٠ هەزار منداڵ دەکرد.

لە ٥ی مانگی مەی ساڵی ٢٠٠٦ دا ڕێکەوتنامەی ئاشتی دارفور (Darfur peace Agreement) لە نێوان حکومەتی سودان و بەشێک لە یاخیبووەکان بە میانگیری دەوڵەتی چاد مۆرکرا، بەشێک سەرکردەی یاخیبووەکان پاش مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی پۆستەکانی بەڕێوەبردنی هەرێمەکەیان لە ئەستۆ گرت، بەشەکەی دیکەش لە یاخیبوان بەردەوام

بوون لەسەر ڕێبازی خۆیان. سکرتێری گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بان کی موون، لە ڕۆژی ١٤ی سێپتێمبەری ٢٠٠٧ دا لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا ڕایگەیاند: لەو باوەڕەدایە کە چارەسەرێکی گشتی و هەتا هەتایی بۆ کێشەی ئاڵۆزی دارفور بوونی نابێت.
ڕۆژی ٢٧-٨-٢٠٠٩ فەرماندەی هێزی کلاوشینەکان ژەنراڵ (Martin Agwai) ڕایگەیاند کە شەڕی سەرەکی لە دەڤەرەکەدا کۆتایی هاتووە و هێزی یاخیبووەکان بە تەواوی لاواز و تێکشکاون و ئێستا تەنها هەندێک پێکدادانی لێرەو لەوێ نەبێت شەڕو پێکدادانی گەورە نەماوە.

## کێشەی دارفور لەبەردەم زلهێزەکاندا

ڕەنگە گرنگترین پرسیار لە کۆتایی ئەم نوسینەدا ئەوەبێت کە بۆچی باشوری سودان گەورەترین پشتیوانی نێودەوڵەتی لێکراو سەرەنجام سەربەخۆیی وەرگرت کەچی کێشەی دارفور تەنها وەک کێشەیەکی مرۆیی تەماشاکراو بایەخێکی سیاسی گرنگ و یەکلاکەرەوەی پێنەدرا؟.
پێدەچێت لێرەدا سێ ڕەگەزی سەرەکی گرنگ لەم دوو کەیسەدا ڕۆڵی بەرچاویان گێڕابێت:
- زۆربەی پترۆلی سودان لە باشوردا بوو، بەڵام لە دافور وێڕای ئەوەی باس لە بوونی یەدەگی نەوتی تێدا دەکرێت، هەتا ئێستا نەوتێکی ئەوتۆی تێدا نەدۆزراوەتەوە.
- زۆربەی هۆزەکانی باشوری سودان کریستیان بوون، بەڵام

دارفور موسڵمانن.

- هۆزەکانی باشوری سودان کولتووری عەرەبییان هەڵنەگرتبوو، بەڵکو ئاینی کریستیانی خۆیان پاراست و نەک تەعریب نەکران بەڵکو زمانی عەرەبیش بەسەریاندا زاڵ نەبوو، کەچی دارفورییەکان وێڕای ئەوەی عەرەب نین بەڵام لەبەرئەوەی هەر هۆزەی زمان و زاراوەی خۆی هەبوو، زمانی دەسەڵات (عەرەبییان) بەکاردەهێنا، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە سیفەتی عەرەبی و موسڵمان بوونیان بەسەردا زەق بێتەوە و لەگەڵ عەرەبەکانی سوداندا جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبێت.

ساڵی٢٠٠٥ ئەمەریکا لە ڕێگای پرۆژەی (Enough Project) ە وە هەموو هەوڵێکی لە بەرژەوەندی هەرێمی باشوری سودان خستەگەڕو سەرەنجام ڕێکەوتنی نیڤاشا لەبەرژەوەندی باشورییەکان مۆرکرا، لە ڕێگای فشارەکانی ئەمەریکاوە بوو باشورییەکان توانیان سێ خاڵی گرنگی سیاسی بەسەر سوداندا بەسەپێنن کە ئەوانیش ( بەشداریکردن لە حوکمکردنی سودان، دابەشکردنی داهاتی نەوت بوو بە ڕێژەی پەنجا بە پەنجا و پاشان دیاریکردنی مافی بڕیاردانی چارونووس بە ئەنجامدانی ئەو ریفراندۆمەی کە ڕۆژی ٩ی ژانیوەی ٢٠١١ ئەنجام درا).

هەر لەو کاتەوە کۆمپانیا ئەمەریکییەکان ( نەوتی و غەیرە نەوتی) پێگەی خۆیان لە باشوری سودان توند کردەوە.

ڕێژەی ٨٠٪ نەوتی سودان لە باشوردا بوو کە جیابوونەوەی خۆی ڕاگەیاند و بوو بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە سودان لە بەرامبەر ئەوەدا ڕوو لە کۆمپانیاکانی دیکە بکات، لە

سەروبەندی کێشەکانی دارفوردا کۆمپانیاکانی چین بەڕێژەی ٤٠٪ و مالیزیا٣٠٪ و کەنەدا ٢٥٪ ئیمتیازی پشکنین و دۆزینەوەی پترۆڵیان وەرگرت، ئەو کۆمپانیایانە لە باشوری سودان رۆلیان نییە بۆیە ناخوازن لە سودان خۆشیدا پێگەیان لاواز بێت، لە ئێستا سودان رۆژانە ١٥٠ هەزار بەرمیل نەوت هەناردە دەکات و چاوەڕوان دەکرێت لە ئایندەیەکی نزیکدا بڕی بەرهەمی ئەو وڵاتە بەرزبکرێتەوە.

وێڕای ئەوەی هەتا ئێستا یەدەگی نەوت لە دارفور ئاشکرا نییەو دەڤەرەکەش یەکێکە لەهەژارترین دەڤەرەکانی ئەو وڵاتەی لە بنەڕەتدا خۆی هەژارە، بەڵام پێدەچێت لە داهاتوودا نەوت لەم دەڤەرە بدۆزرێتەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی کە ناوچەی ( ئەبیی- Abeyi )هێشتا لە نێوان باشوری سودان و دەوڵەتی سوداندا یەکلانەکراوەتەوە، ئەم ناوچەیە کە پترۆلێکی زۆری تێدا دۆزراوەتەوە بەپێی نەخشەی کۆمپانیای نەوتی چینی (CNPC) دەبێت بە بۆڕییەکی تایبەتدا ئەو نەوتە لە رێگای دارفورەوە بگاتە کەنارەکانی دەریای سور، ئەم هۆیانە پێکەوە بوونەتە هۆکاری ئەوەی کە ئەو وڵاتانە پشتیوانی تەواو لە سودان بکەن، هەروەها سودان خۆشی بەهەموو توانایەکەوە هەوڵی ئەو بدات ئەو دەڤەرە لە چوارچێوەی جوگرافی وڵاتی خۆیدا دەستەمۆ بکات، چونکە سەرباری پترۆڵ سەرچاوەیەکی دیکەی زۆر گرنگ بۆ سودان ئاوە، بەپێی توێژینەوە زانستییەکان دەمارێکی زۆر مەزنی ئاوی ژێر زەوی لە دارفوردا هەیە، ئەمە وێڕای بوونی یۆرانیۆم .

لە مانگی تەموزی ٢٠٠٨ یەکێک لە پەیامنێرەکانی ئاژانسی هەواڵی بی بی سی، کۆمەڵێک زانیاری لەسەر هاوکاریکردنی حکومەتی چین بۆ

حکومەتی سودان بڵاوکردەوە، ئەم هەنگاوەی چین لە دژی ئەو ئابلوقە سەربازیانەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو کە ناردنی هەموو جۆرە چەکێکی بۆ سودان قەدەغە کردبوو. بەپێی زانیارییەکانی ئەو ئاژانسەی هەواڵ چەندین کۆنتەینەری گەورەی چەکی سوک و قورس و چەندین هەلیکۆبتەری جەنگی و بارهەڵگر لە لایەن حکومەتی چینەوە دراوە بە سودان. راپۆرت و زانیاریەکانی ڕێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ و لێبوردنی نێو دەوڵەتی جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە حکومەتی سودان بەردەوام و لە پاش ئابڵوقە و ئەمبارگۆی چەک، لە چەندین وڵاتی وەک چین و روسیاو روسیای سپی وئۆکرانیاو ئێرانەوە چەکی جۆراوجۆری بەدەست گەیشتووە، لە نوێترین راپۆرتی ئەمنستی ئەنتەر ناشیۆناڵ کە رۆژی ٩-٢-٢٠١٢ لە ژێر ناوی (No end to violence in Darfur — توندوتیژی بێ کۆتاییە لە دارفور) بڵاوکراوەتەوە، وێڕای خستنە رووی ئەو زانیاریانە داوا لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکات کە لەم بارەوە کاری پێویست ئەنجام بدات، چونکە تەنها لە ساڵی ٢٠١١ دا ٧٠ هەزار کەس لە دارفور بەو چەکانە کوژراون .

باشوری سودان زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوانەکەی نە عەرەبن و نە موسڵمانن، ئەمەش خاڵێکی زۆر بەهێزە بۆ ئەو هەرێمە کە بتوانێت بەهۆی چەوساندنەوەی ئاینی و رەگەزپەرستیەوە، سۆزی دنیای خۆرئاوای کریستیان بەلای خۆیدا راکێشێت، بەتایبەت کە دەوڵەتی داگیرکەری وەک سودان دەوڵەتێکی نەتەوە پەرست و شۆڤێنستی عەرەبییە کە دەیەوێت شەریعەتی ئیسلامی بەسەر ئەو دانیشتوانەدا بسەپێنێت، ئەو دەوڵەتانەی کە دەبنە هاوسێی باشوری سودان، جگە

له سودان زۆربەی هەرە زۆریان هەمان درێژکراوەی هۆزو تیرەکانی باشوری سودانیان هەیە، بەمجۆرە دەوڵەتی نوێی باشور نابێتە هەڕەشە بۆ پەرتکردنی ئەو وڵاتانەو شێواندنی ئاسایش و ئارامیان، هەر هەمان هۆکاریشە کە وایکردووە خودی حکومەتی ئەمەریکا بەرامبەر بە مەسەلەی دارفور کە تا رادەیەکی زۆر لە رووی مرۆیی و سیاسیەوە هاوشێوەیە لەگەڵ مەسەلەی باشور خۆی بێدەنگ بکات، ئەگەر ئەم بێدەنگییە هۆکارێکی هەبێت ئەوە تەنها هێندە هەیە کە خەڵکی دارفور هەرچەندە عەرەبیش نین بەڵام لەبەر ئەوەی موسڵمانن ئەوە ئیتر کێشەکە دەبێتە کارێکی تایبەت بە ناوخۆی سودان و شایەنی ئەوە نابێت کە ئەمەریکا سەرئێشەی زیاتر بۆ خۆی دروست بکات.

لە سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠٤ دا کۆڵن پاوەڵ وەزیری دەرەوەی بەڕێوەبەرایەتی بوش لە گەرماوگەرمی هەڵبژاردنەکانی ئەمەریکادا بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ کردەوەکانی جینۆسایدی دارفور کرد بەڵام وادەرکەوت کە ئەمە تەنها وەک باسکردنی مەسەلەی جینۆسایدی ئەرمەنەکان بوو، بۆ خۆ دزینەوە بوو لەو بارودۆخ و تەنگژە سیاسی و سەربازییەی کە ئەمەریکا لە عێراقدا دووچاری هاتبوو، پاش کۆتایی بانگەشەو سەرکەوتنیان بۆ جاری دووەم لە هەڵبژاردنەکاندا، ئیتر ئەم دوو کەیسە لە کولەکەی تەپیشدا ناویان نەما.

.....



ئەم وێنەیە بە کامێرای ڕۆژنامەنووس (Kevin Carter) لە ساڵی ١٩٩٣ لە سودان گیراوە.

کیڤن کارتەر ڕۆژنامەنووس و وێنەگرێکی بەناو بانگ لە باشووری ئەفریقا لە دایک بووە.
لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٩٣ هەستا بە گەشتێک بۆ سودان،لە گوندی «ئایود» ،لەوکاتە گوێی لە نوزانەوەی منداڵێکی لاشە لاوازی کزو ئێسک پووکاوە دەبێت،منداڵەکە بەهۆی لاوازی لەشیەوە توانای ڕۆشتن وجوڵەی نەمابوو لەکاتێکدا لەڕێگادابوو تا بگاتە بنکەی دابەشکردنی خۆراک لەو شوێنە،لەو کاتەدا داڵێک لەنزیکی منداڵەکە دەنیشێتەوە،کارتەر دەڵێت : بۆماوەی ٢٠ خولەک چاوەڕێمکرد تاکو بزانم داڵەکە چی بەسەر منداڵەکە دەهێنێت بەڵام دوای ئەوە بڕیارمدا کە وێنەکە بگرم و پاشان داڵەکەم دوور خستەوە لەمنداڵەکە ،کارتەر لەسەر ئەم ڕوداوە زۆر سەرزەنشتکرا لەسەر ئەوەی کەبۆچی کارتەر وێنەی گرتووە و یارمەتی ئەم منداڵە بچوکەی نەداوە!!.

ئەم وێنەیە فرۆشرا بە رۆژنامەی نیۆرک تایمز. بۆ یەکەمجار لە ٢٦ ی مارسی ١٩٩٣ دا بڵاوکرایەوە،هەر لەو شەوەدا سەدان کەس پەیوەندیان بە سەرنوسەری رۆژنامەکەوە کرد بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ منداڵەکە رزگاری بووە یان مردووە،کە ئەوەش وای لە سەرنووسەری رۆژنامەکە کرد ئاگاداریەکی تایبەت لەسەر رۆژنامەکە دەربکات و بنوسێت (منداڵە بچوکەکە توانیویەتی بڕوات و دوور بکەوێتەوە لە داڵەکە بەڵام چارەنووسی کۆتایی منداڵەکە هێشتا نادیارە).

لە ٢ی مانگی چواری ساڵی ١٩٩٤ کیڤن کارتەر پەیوەندیەکی تەلەفۆنی پێگەیشت لە سەنووسەری ئەو کاتەی رۆژنامەی نیۆرک تایمز کە ناوی « نانسی بۆرسکی» بوو ،خاتوو بۆرسکی بە کارتەری راگەیاند کە وێنەکەی بەناوبانگترین خەڵاتی بەدەستهێناوە لەبواری وێنەی رۆژنامەوانیدا ئەویش خەڵاتی پۆلیتزەر بۆ وێنە بوو،ئەوەبوو لە بەرواری ٢٣ی مانگی ٥ ی ساڵی ١٩٩٤ دا لەنوسینگەی لۆو میمۆریاڵ لە زانکۆی «کۆڵۆمبیا» خەڵاتەکەی پێ بەخشرا.

لەبەواری ٢٧ ی مانگی تەموزی ساڵی ١٩٩٤ دا کیڤن کارتەر سەیارەکەی بەرەو ڕوباری «برامفونتاینسبروی» برد کە ڕوبارێکی نزیکە دەکەوێتە دەورووبەری بەشی باکوری شاری «جوهانسبێرگ» کە پایتەختی وڵاتی باشووری ئەفریقایە،لەو شوێنەدا کارتەر زۆربەی ژیانی منداڵی بەسەربردبوو هەر لەو شوێنەدا دوای ئەوەی کە بۆڕی گزۆز ی دوکەڵی سەیارەکە ی بەدەستی خۆی دەباتە ناو سەیارەکەیەوە بەهۆی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەوە خۆی کووشت و لەدوای خۆی نامەیەکی بەجێهێلابوو بۆ کەس وکارو هاوڕێکانی..

هەندێک لە دۆستە نزیکەکانی دەڵێن کە گوایە کارتەر لەژێر کاریگەری ئەم وێنەیەی کە بەدەستی خۆی گرتبووی خۆی کووشتووە چونکە هەر دوای بڵاوکردنەوەی وێنەکە باری دەروونی زۆر تێک چووە...

# سەرچاوەکان

کتێب:


Leanne Asbreuk, Darfur Een Fotogenieke , Ramp Erasmus Universiteit Rotterdam ٢٠٠٨ , Rotterdam, Nederland

Dienke Vos, Darfur de onvolmakteramp, Universitiet Utrecht, ٢٠٠٦ , Nederland

د. زكى البحيري، دارفور اصول الازمة، كلية التربية، جامعة المنصورة، دار الشمس للطباعة، عين الشمس مصر.٢٠٠٨

د. زكي البحيري، مشكله دارفور الجذور التاريخية، كلية التربية، جامعة المنصورة، دار الشمس للطباعة، عين الشمس مصر.٢٠٠٦

د. مصطفي عثمان اسماعيل، دارفور الماضي، الحاضر، المستقبل،دار الاصالة، الطبعة الاولى،٢٠٠٧

كمال جزولي، الحقيقة في دارفور، عرض موجز لتقرير لجنة التحقيق الدولية، مركز قاهرة لدراسات حقوق الانسان، قاهرة، الطبعة الاوليى٢٠٠٦

.د. احمد محمد وهبان، السياسة الامريكية تجاه مشكلة دارفور، كلية العلوم السياسية، جامعة الاسكندرية، دار الشمس،مصر ٢٠٠٧

....

پێگەی ئەلكترۆنی:

پێگەی ویلایەتی دارفور

«http://southdarfur.gov.sd»

http://southdarfur.gov.sd

پێگەی كۆمیسیۆنی مافی مرۆڤ

http://www.unitedhumanrights.org/»

«/genocide

رۆژنامەی تراوی هۆڵەندی

«/http://www.trouw.nl»

پێگەی تایبەت بە نێردراوی نەتەوە یەككگرتووەكان بۆ سودان.

«http://www.janpronk.nl»

سەنتەری ژماردنی ململانێکان
«http://conflictenteller.nl»

ماڵپەڕی وەزارەتی بەرگری سودان

/http://www.mod.gov.sd/portal

پەیمانگای عەرەبی مافەکانی مرۆڤ
«/http://aihr-iadh.org»

لێکۆڵینەوەیەکی میشێل شمیت بە زمانی هۆڵەندی
http://www.anarkismo. «١٣١١١٠/١٩/٠٢/٢٠١٢/sa
net

بابەتێکی نوسەر بەناوی ( نهێنییەکانی سەرکەوتنی باشوری سودان)
لە رۆژنامەی ئاسۆ
http://xendan.org/drejaWtar.»
«٢٢٠٩=Jmara&٤٢٢=aspx?NusarID

http://www.unitedhumanrights.org/
/genocide
http://www.dewereldmorgen.be

http://www.alsharq.net.»
«١٢١١١٠/١٩/٠٢/٢٠١٢/sa

http://www.sudanile.com

http://www.alittihad.ae/details.»
«٢٠١٢=y&٥٢٥٠=php?id

ئێمە زۆر جار بۆ ئەوەی کێشمان دابەزێنین بڕیار دەدەین کە
هەفتەیەک نان خواردن کەمکەینەوە، ئەمە کارێکی باشە، بەڵام
لێرەدا ئیمە باس لە خەڵکانێک دەکەین کە بەدەستی خۆیان ئەو
بڕیارەیان نەداوە. لێرە خەڵکی بەڕاستی برسیانەو کێشیان
دادەبەزێ و لە برساندا دەمرن.

Claudia de Breij پەیامنێری رادیۆی 3 FM ی هۆڵەندا

# Rehendekanî Kêşey
# Darfur

Nusînî
Rêkewt Ismaîl Ibrahîm

3000 ID

ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران (ی. ن. ک)
2013